# نەوژین

ژمارە (٢١) یەکشەمە ٢٠١٨/٨/٢٦

مانگنامەیەکی تایبەتە بە پرسەکانی ژنان، رادیۆی دەنگ بە پاڵپشتی سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی NED ئەمریکی لەگەرمیان دەریدەکات




دایکایەتی رێگەی هونەری لێ نەگۆڕیوە

7»»

# 2 ژن لەگەرمیانەوە پاڵێوراوی هەڵبژاردنی پارلەمانی کوردستانن

■ نەوژین

**بۆ هەڵبژاردنی پارلەمانی کوردستان، لە گەرمیان و لەناو سەرجەم لیستە بەشدارەکان دا، تەنها ٢ ژن وەکو پاڵێوراو هەن.**

بەپێی بەدواداچونێکی (نەوژین)، بۆ هەڵبژاردنی پارلەمانی کوردستان کە بڕیارە کۆتایی مانگی ئەیلولی ئەمساڵ بەڕێوەبچێت، لەنێو لیستە جیاوازەکان دا لە گەرمیان سەروی ٢٠ پاڵێوراو «کاندیدا» هەیە، بەڵام لەو رێژەیە تەنها (٢) پاڵێوراویان ژنن.

هەربەپێی زانیارییەکان، هەریەکە لە (شیرین ئەمین) لە لیستی بزوتنەوەی (گۆڕان) و (فرمێسک عوسمان) لە لیستی (هاوپەیمانی بۆ دیموکراسی و دادپەروەریی)، وەکو دو پاڵێوراویی گەرمیانی هەن، پاڵێوراوەکانی دیکە لە رەگەزی نێرن.

ئەمەش لەکاتێکدایە کە لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق کە مانگی ئایاری ئەمساڵ بەڕێوەچو، ژمارەی کاندیدا ژنەکان سەروی ٦ کەس بون لەگەرمیان دا لە ناو سەرجەم لیستەکاندا.

شیرین ئەمین، پاڵێوراو لە لیستی بزوتنەوەی (گۆڕان)، بە (نەوژین)ی راگەیاند: لەسەر داوای ژمارەیەک لە هاوڕێیان و کەسوکاری شەهیدانی قەڵەم و خۆپیشاندانەکان، بڕیاری داوە خۆی بپاڵێوێت.

لەلایەکی ترەوە، پارتی دیموکراتی کوردستان، لەسنوری لقی گەرمیانی دا ژنێکی کاندید کردوە کە لە دەربەندیخانە، ئەگەرچی ئەو شارە لەروی کارگێڕیەوە سەر بە پارێزگای سلێمانییە و لەسەر ئیدارەی گەرمیان هەژمار ناکرێت.

خولی ئێستای پارلەمانی کوردستان، ٣ پارلەمانتاری گەرمیانی تێدایە کە هەرسێکیان لە رەگەزی نێرن، لە خولی پێشوتریشدا پارلەمانتارێکی ژن هەبو کە (پەیام ئەحمەد) بو لە لیستی (گۆڕان).

هەڵبژاردنی ئەمجارەی پارلەمانی کوردستان، بڕیارە لە ٣٠ی ئەیلولی ئەمساڵ بەڕێوەبچێت، لەکاتێکدا دەنگۆ و ئەگەرەکانی دواخستنی هەڵبژاردنەکەش باسێکی گەرمە.





بۆچی کچان بەهرەکانیان دەشارنەوە؟

3»»



بۆ کارکردن ژنان شەو و رۆژ ناناسن

5»»

## بەناوی فێربونی پیشەوە کار بە منداڵان دەکرێت

4»»



## کچە گوندییەک بەبێ بڕوانامە ئەندازیارە

6»»





بەرگریی کردنی منداڵبون (منع)..

لە حەپ و دەرزییەوە بۆ چاندنی ژێر پێست

10»»

# لە نەخۆشخانەی شەهید شێرەی نەقیب سوکایەتی بەنەخۆش دەکرێت؟




■ نەوژین

**«لەلایەن کارمەندێکەوە سوکایەتی زۆرمان پێکرا، گەیشتە ئەو ڕادەیەی تف لە دایکم بکات». ئەمە ناوەڕۆکی ڕەخنەی کچێکی گەرمیانە بەناوی (تانیا کفری) لە نەخۆشخانەی شەهید شێرەی نەقیب بۆ ژنان و منداڵبون لەکەلار، کاتێک لەگەڵ دایکی دا بۆ هاوەڵیی کردنی خوشکێکی کە لە سەروبەندی منداڵبون دا بوە، سەردانی نەخۆشخانەکەیان کردوە.**

بڵاوبونـــەوەی وتەکانـــی ئـــەم کچـــە، کاردانـــەوەی زۆری لـــە تـــۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا دروست کرد، هەروەک جارێکی تر پرسی «سوکایەتییکردن بە ژنان»ی لە نەخۆشـــخانەکانی سنوری گەرمیـــان و بەتایبەتی نەخۆشـــخانەی شەهید شێرەی نەقیب، هێنایە ئاراوە.

ئەمـــە یەکەمجـــار نییە بە ئاشـــکرا و نهێنی، قسە لەســـەر ڕەفتاری ستافی نەخۆشـــخانەکە دەکرێت، بەڵام جێگری بەڕێوبەری نەخۆشـــخانەکە پێیوایە کە ناهەقییەک لەو ڕووەوە هەیە.

گۆران محەمەد، ئامـــاژەی بەوەکرد کە دەرگای ئـــەوان کراوەیە بۆ هەر ڕەخنە و تێبینیی و ســـکاڵایەک و لەو کاتانەدا کە دەوترێت ســـوکایەتی کراوە، دەبێت کەســـەکە ســـەردانیان بکات و سکاڵا تۆمار بکات.

بەگەڕانـــەوە بـــۆ ئـــەو ڕوداوەی لەنەخۆشخانەکە لەم ماوەیەی ڕابردودا ڕویدا، تانیا کفری، ئاماژە بەوەدەکات: کارمەندێک لە نەخۆشـــخانەی شـــەهید شـــێرەی نەقیب بۆ ژنان و منداڵبون لە کەلار لەکاتی نەشـــتەرگەری دا جنێوی پێداون و تفی لە دایکی کردوە.

تانیـــا کفـــری، کـــە هاوڵاتیەکـــە و بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری بۆ خوشکەکەی ســـەردانی ئەو نەخۆشخانەیەی کردوە، ڕۆژی ٩ی ئابـــی ٢٠١٨، بـــە (ڕادیۆی دەنـــگ)ی وتوە: لەلایـــەن کارمەندانی تەندروســـتیەوە و بـــە پێـــش چـــاوی پزیشکەوە ســـوکایەتی زۆر بە خۆمان و نەخۆشـــەکەمان کراوە و بە بەرچاوی هەموانەوە «تف کراوەتە ڕوی دایکم».

> **ناکرێت لەبەر ڕوداوێک هەمو خزمەتەکانمان ڕەد بکرێتەوە**

ئەو هاوڵاتییە، ئاماژەی بەوەشکرد کە بە کارمەندەکەی وتوە کە لەلای بەڕێوبەری نەخۆشـــخانەکە ســـکاڵا تۆمار دەکات، لەبەرامبـــەردا کارمەندەکە وتویەتی کە حساب بۆ بەڕێوبەرەکەی ناکات.

وتیشـــی: ســـەرەڕای ئـــەوەی کـــە ســـوکایەتیان پێکراوە، بەو هۆیەشەوە نەشـــتەرگەرییەکەیان بـــۆ نەکردوین و ڕۆشـــتوینەتە نەخۆشـــخانەی ئەهلـــی نەشتەرگەریمان کردوە.

لەبەرامبـــەردا، چیـــرۆک و قســـەکانی ئەو کارمەنـــدەی کە بەوتـــەی کچەکە تفی تێکردون و ســـوکایەتی پێکردون، پێچەوانە و جیاوازە.

ئەو کارمەندە، دو ڕۆژ دوای ئەو ڕوداوە، هەر بە ڕادیۆی دەنگـــی ڕاگەیاندوە کە نەک ئەو ســـوکایەتی نەکـــردوە و تفی نەکـــردوە، بەڵکـــو ئەو کچـــە و دایکی سوکایەتییان پێکردوە و بگرە دایکیشی تفی تێکردوە.

ئـــەو کارمەندە کە خـــۆی داوای کردوە ناوی بڵاونەکرێتەوە، لە ڕونکردنەوەیەکدا وتویەتی: ئـــەو کچە و دایکی، نەخۆش نەبـــون و مرافـــق بـــون، لەکاتێکدا نە پزیشـــکن و نە کارمەندی تەندروستی، داوایـــان کـــردوە نەشـــتەرگەریی بـــۆ نەخۆشـــەکەیان بکرێت بەبـــێ ئەوەی پزیشکی پسپۆڕ بڕیاری لەبارەوە بدات.

لەبـــارەی ئـــەوەی کـــە تفی کـــردوە، کارمەندەکە دەڵێـــت: «بەپێچەوانەوە دایکـــی ئـــەو تفی تێکردم و پاڵیشـــی پێوەنـــام و چەندین جنێوی داوە و زۆر سوکایەتی کردوەو هەندێک وشەی وتوە کە بۆ ئەوە ناشێن بڵاو بکرێنەوە».

دەشـــڵێت: هـــەروەک تەهدیدی حزبیی کردوم و وتویەتی من حزبم لەپشـــتە و نقڵی خانەقینت ئەکەم، بۆ ئەم قسانەش (٥) شایەتم هەیە.

ئەم حاڵەتەی کە ڕویـــداوە، یەکەمجار نییـــە، بەڵکو لەپێشوتریشـــدا زۆرجار بـــاس لە ســـوکایەتیکردن بـــە ژنان و نەخۆشەکان لە نەخۆشـــخانەی ناوبراو کـــراوە، بـــەڵام جێگـــری بەڕێوبـــەری نەخۆشخانەکە قسەیەکی تر دەکات.

گۆران محەمەد، ئاماژەی بەوەکردوە کە هەر کەســـێک تێبینی یان سکاڵایەکی هەیـــە، دەتوانێت ســـەردانیان بکات و تۆماری بکات، بۆ ئەوەی ڕێڕەوی یاسایی بگیرێتەبەر و لێکۆڵینەوە بکرێت.

ئامـــاژەی بەوەشـــداوە کـــە ئـــەوان خزمەتێکی زۆری ژنان دەکەن و ناکرێت لەبەر ڕوداوێک یـــان دەنگۆیەک، هەمو خزمەتەکانیان ڕەد بکرێتەوە.

هـــەروەک لەبارەی ئەو کێشەیەشـــەوە ڕایگەیاند لەلایەن تەندروستی گەرمیان لیژنەیەکـــی لێکۆڵینـــەوە پێکهاتوە و چاوەڕێی دەرەنجامەکەی دەکەن.

# ژنانی جیابوەوە دەترسن دوبارە هاوسەرگیریی بکەنەوە

■ نەوژین، ژینۆ عەلی

**«من ماوەیەکی کەم لەگەڵ هاوسەرەکەم بوم و هیچ منداڵێکم لێی نەبو، هاوسەرەکەم و ماڵی باوکی هێندە خراپبون لەگەڵم وایلێکردم جارێکیتر تەنانەت بە خەونیش بیر لەهاوسەرگیری نەکەمەوە».**

**ئەمە قسەی (تەلار)ی تەمەن (٥٦) ساڵە کە ماوەی (٣٥) ساڵە لە هاوسەرەکەی جیابوەتەوە.**

تەلار، یەکێکە لەو ژنانەی هاوسەرگیری بـــە بەشـــێکی گرنگی ژیانـــی داناوە و هیوایەکـــی زۆری لەســـەر هەڵچنی بو بە جۆرێک بەســـەرچاوەی خۆشبەختی دەزانی، بەڵام (تـــەلار) و هەندێک لەو ژنانـــە هەر زو ڕێگەی خۆشـــبەختییان لـــێ ون ئەبێـــت و بەجیابونەوە ئەگەن بەکۆتایی هاوسەرگیرییان.

تـــەلار، نـــاوی خـــوازراوی ژنێکـــی جیابوەوەیە و بەردەوامبو لە باسکردنی چیرۆکی ژیانی و وتی: «پەشیمان نیم لەو بڕیارەی کەداومە و تاوەکو ئێستاش خەڵکـــی بەبەردەوامی پێـــم دەڵێن بۆ زەواج ناکەی یان چۆن تائێستا زەواجت نەکردوە؟ بەڵام من بڕیارم داوە و گوێ لە قســـەی خەڵکی ناگرم و جارێکی تر هاوسەرگیری ناکەمەوە».

هەندێک لەو ژنانە دوای جیابونەوە ترسی خراپی ئەزمونی یەکەمیان وایان لێدەکات هەنگاو نەنێن بۆ دوبارەکردنەوەی.

نێرگزـی تەمەن (٢٩) ساڵ، یەکێکیترە لەو ژنانـــەی جیابوەتەوە. بۆ (نەوژین) وتی: «من بە ویستی خۆم و ماڵەوەش هاوســـەرگیریم کرد و هیـــچ زۆریەکم لەسەر نەبو و ماڵی جیای خۆمم هەبو، بەڵام هەر لەسەرەتای زەواجەکەمانەوە ناکۆکی هەبو لەنێوان من و مێردەکەم، زۆرجار هەر لەماڵـــی باوکم بوم، دوای چەند ســـاڵێک هاوسەرەکەم کۆچی کرد بـــۆ دەرەوەی وڵات، منیـــش بەتەواوی بڕیاری جیابونەوەم دا».

> **بێ متمانەیی لەهۆکارەکانی دوبارە هاوسەرگیریی نەکردنەوەی ژنانە**

نێرگـــز، بـــە ڕوخســـارێکەوە کە خەم دایپۆشـــیوە بەردەوامبـــو «لەکاتـــی جیابونەوەم تاکو ئێستا زۆرکەس هاتون بـــۆ خوازبێنیم، بەڵام مـــن بڕیارمداوەو هاوسەرگیریی ناکەمەوە، چونکە ئەوەی یەکەمم هەڵەیەکی گـــەورە بو لە ژیانم و بڕیـــاری جیابونـــەوە قورســـترین و ناخۆشترین بڕیاری ژیانە».

ژنـــان جیابونەوەیـــان بـــە ماڵوێرانی ئەچوێنن و لەوەش قورســـتر کە دوای جیابونـــەوە دێتـــە ڕێگەیـــان قســـە و قســـەڵۆکی کۆمەڵگەیە، ئـــەوان دەڵێن تەنانەت بەدڵی خۆیان ناتوانن بچنە بەر دەرگای ماڵەوەشیان.

ســـۆلافـی تەمەن (٢٨)ســـاڵ، ژنێکی جیابوەوەیە، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «من کاتێک جیابومەوە ماڵم وێران بو بەوەی من بێوەژنم و خەڵکی بەچاوێکی ترەوە سەیرم دەکەن، قسە و توانجی خەڵکیش زۆر بێتاقەتم دەکات و کاریگەری زۆری هەیە لەسەرم».



بـــەڕای تویژەرێکی دەرونـــی، ترس لە دوبارەبونەوەی جیابونەوەو چەشتنەوەی ئازارەکانـــی پێشـــو، هۆکارێی گرنگی دوبارە هاوسەرگیری نەکردنەوەی ژنانە.

کاررزان فوئـــاد، توێـــژەری دەرونی، بۆ نەوژین وتی: «تـــرس لە دوبارە تەڵاق دانـــەوە و بێ متمانەیـــی ژنان بە پیاو و بـــێ متمانەی ژنان بە خودی خۆیان، لەهۆکارەکانـــی دوبارە هاوســـەرگیریی نەکردنـــەوەی ژنانن، چونکە هەمیشـــە لەجیابونـــەوەدا ژنان باجدەری یەکەمن و زۆرتریـــن قســـە و قســـەڵۆکیان دێتەسەر».

ئـــەو توێـــژەرە باس لـــەوە دەکات کە پرۆســـەی هاوســـەرگیری لای ئێمـــە لە گـــرەو و قومار دەچێـــت «زۆرجار لای ئێمـــە زەواج لە گـــرەو یان قومار دەچێـــت، بەوەی کە بە تایبەت ئافرەت ناتوانێـــت هەڵســـەنگاندنی تەواو بکات بـــۆ ئەو پیاوەی کـــە دەبێتە هاوژینی، چونکە دەرفەتی ناسینی بەرامبەرەکەی پێنادرێت، یان ئەوەیە زەواجی ســـوتفە دەکات یـــان ناچـــار دەکرێـــت لە نێو کۆمەڵێـــک خراپدا خراپەیەکی باشـــتر هەڵبژێرێت».

بەپێچەوانەی ئەو ژنانەی کە جیابونەتەوە و نایەنەوێ دوبارە هاوسەرگیری بکەن، هەندێک لەو ژنانە دوبارە هاوسەرگیری دەکەنـــەوە و وەکو خۆشـــیان دەڵێن: «خۆشبەختن».

جوانـــە ڕەحیـــم، (٣٠) ســـاڵ، ژنێکی جیابوەوەیـــە و دوبارە هاوســـەرگیری کردوەتەوە، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «من ماوەی چوار ســـاڵ بو لەگەڵ هاوسەری یەکەممدا بوم، بەڵام بەڕادەیەک خراپبو لەگەڵم توشـــی نەخۆشی هاتبوم، دوای ئـــەوەی جیابومەوە ئەمـــوت جارێکی تـــر هاوســـەرگیری ناکـــەم، وامدەزانی خۆشـــبەختی جارێکی تـــر نابێتەوە بە میوانم، بەڵام وانەبو»

جوانە، بە زەردەخەنەیەکەوە دەشڵێت: «من بیـــرم کردەوە کە واز لەقســـەی خەڵکـــی بێنـــم و بڕیـــارم دا دوبـــارە هاوســـەرگیری بکەمـــەوە و ئێســـتاش خاوەنی منداڵێکم و زۆر خۆشبەختم».

# خێزانەکان خۆشەویستیی بە کچانیان نادەن و ئەوانیش لە دەرەوە بۆی دەگەڕێن

■ نەوژین، زریان محەمەد

**«من بەهۆی ئەوەی ماڵەوەمان خۆشەویستیان پێنەداوم ناچار بۆ پرکردنەوەی ئەو بۆشاییە پەنام بردە بەر کەسێک خەریک بو توشی هەڵەم بکات، بەڵام لەوە تێگەشتم من کە بۆ خێزانەکەی خۆم جێی بایەخ نەبم ئاخۆ بۆ کەسێکی بێگانە چۆن بم». ئەمە وتەی (سارە)یە کە وەک خۆی دەڵێت لەلایەن خانەوادەکەیەوە خۆشەویستیی پێنەدراوە.**

> خێزانی ئێمە خۆشەویستی کچەکانیان پشتگوێ خستوە



سارە، ناوی خوازراوی کچێکی شاری کەلارە، بە ئاهێکی قوڵەوە بۆ (نەوژین) دواو وتی: «من بە ئەندازەیەک لە خۆشەویستی دایک و باوکم بێبەری بوم، توشی هەڵەش بوم، بەوهۆیەی بۆ پرکردنەوەی ئەو بۆشاییەی خۆشەویستی بروام بە کوڕێک کرد کە خەریک بو توشی هەڵەم بکات، دواتر لەوە تێگەشتم کە من بۆ خێزانەکەی خۆم جێی بایەخ نەبم ئاخۆ بۆ کەسێکی بێگانە چۆن جێی بایەخ بم».

وتیشی: «من بە پێنەدانی خۆشەویستیشەوە نەوەستان هیچ پارەشیان پێ نەدام، ناچار پەنام بردە کارکردن ئەویش بە چەندین شەڕ و سەرسەختی خۆم دەستم بە کارکردن کرد».

ئەو کچە باس لەوەدەکات ئێستا کێشەی دارایی نیە، بەڵکو کێشەی خۆشەویستی و گرنگی پێدانی هەیە «زۆر قورسە بۆم کە دەبینم بەو شێوە بێ سۆز و خۆشەویستین لەگەڵما، هیچ کاتیش نەم هێشتوە هەست بەوە بکەن کە چەند خەم دەخۆم بەوە، بۆیە دەچمە ژورەکەی خۆم و دەرگا دادەخەم لەسەر خۆم و تا بتوانم دەگریم».

بە هەمان شێوەی (سارە)، ئەژین-یش هیچی لەو زیاتر نیە و بێبەرییە لە خۆشەویستی خێزانەکەی و بە روخسارێکی خەماوییەوە وتی: «بە بەرچاوی خۆمەوە دەبینم ماڵەوە چەند گرنگی بە براکانم دەدەن، بەڵام هیچ بەمنی نادەن، ئەمەش زۆر قورسە بۆم».

ئەژین، ٢٥ ساڵ، ناوی خوازراوی کچێکی دانیشتوی ناحییەی رزگارییە و سەبارەت بەم پرسە، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «من لە ماڵەوە هەست بەوە دەکەم کەهیچ گرنگیم پێنادرێت، چونکە هەر لە یەکەمجار کە نمرەم نەهێنا لە پۆلی ١٢، حەزم کرد لە کۆلێژێکی ئەهلیی درێژە بەخوێندن بدەم، بەڵام ئەوان بە سوکایەتییەوە دەیانوت چۆن پارە لەو شتانە سەرف دەکەین».

وتیشی: «من هیچ شتێکم بەدەست خۆم نیە تەنانەت ئەو جلانەی ئەیپۆشم، بە چاوی خۆیشم دەبینم ماڵەوە چەند گرنگی بە براکانم دەدەن و بە منی نادەن».

لە بەرامبەریشدا، سەبارەت بە کاریگەری پێنەدانی خۆشەویستی بە کچان لەلایەن خێزانەکانەوە، توێژەرێکی کۆمەڵایەتی دەڵێت: خێزانی کوردی ئێمە لە ئاست بەرپرسیارێتی پەروەردە کردنی منالڵدا نین.

کارزان فوئاد، توێژەری کۆمەلایەتی بۆ (نەوژین) دەڵێت: «خێزانی ئێمە لە ئاست ئەو بەرپرسیارێتیە پەروەردەیی و رەوشتیەدا نەبوە و خاڵیە لە ئەرک و بەرپرسیارێتی».

وتیشی: «بە هۆی کلتوری نێرسالاری و دابونەریت کە بارگاوین بە بیری کۆنەپەرستی، کە تێیدا خۆشەویستی و گرنگیپێدان بە کچەکانیان پشتگوێ خستوە».

وتیشی: باشترین شتیش بۆ ئەوەی کچەکانیان بکەن بە کۆیلەیەکی باش، دو رەفتاری سەرەکی هەیە بەرامبەریان دەیکەن، یەکەم: ناهێڵن ببێت بە خاوەنی ئابوری سەربەخۆ، دوەمیش، بێبەش کردنیەتی لە خۆشەویستی و ناز پێدان».

بە پێچەوانەی ئەو کچانەی کە لەلایەن خێزانەکانیانەوە پشتگوێخراون و بێبەری بون لە سۆز و خۆشەویستی، بەشێک لە کچان گرنگیی تەواویان پێدەدرێت و لە ژێر چەتری خۆشەویستی خێزانەکانیان ماونەتەوە.

جوان ئیسماعیل، ٢١ساڵ، بۆ (نەوژین) وتی: «لە خێزانەکەم دا هەرگیز هەستم بەبێ نازیی نەکردوە و باشترین و خۆشترین ژیانم هەیە، هەرگیز بێ دڵیان نەکردوم و نەیان هێشتوە پەنا بۆ هیچ کەسێ لەدەرەوەی خێزانەکەم ببەم بۆ ئەو مەبەستانە».

وتیشی: «هیچ کەسێک نیە لەم دونیایە وەک دایکم بێت بۆ پێدانی خۆشەویستی بە منالەکانی».

---

# بۆچی کچان بەهرەکانیان دەشارنەوە؟



دوان لەو تابلۆیانەی کە کچێک دروستی کردون، بەڵام پیشانی کەسوکارەکەی نەداون



■ نەوژین، ئاسیا حسێن

**بەشێکی بەرچاو لە کچان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە بەهۆی پشتگیریی نەکردنی کەسوکار و خێزانەکانیان و بگرە دڵسارد کردنەوەشیان، دەستبەردای ئەو بەهرانە دەبن کەلەناخیاندا چرۆ دەکات، ئەمەش هەم دڵتەنگیان دەکات و هەمیش خۆیان بە پەراوێزخراو دێتە بەرچاو.**

سازان، ١٨ ساڵ، ناوی خوازراوی کچێکی نیگارکێشە، کە چەند ساڵێکە وێنە دەکێشێت، بەڵام وێنەکانی لە کونجێکی ژورەکەیدا دەشارێتەوە تاوەکو کەس نەیبینێت.

لەبارەی هۆکاری شاردنەوەی هونەرەکەیەوە، (سازان) بە دڵێکی خەماوییەوە وتی: «خێزانەکەم وێنەکێشان بە بێکاریی دەزانن، ئەوان لە منالیەوە حەزیان لێ نەبو من سەرقاڵی وێنەکێشان بم».

سازان، بەردەوام بو و وتی: «کە تەمەنم کەمتر بو، وێنەکانم پیشانی دایک و باوکم دەدا، بەڵام هەستم کرد ئەوان پێیان گرنگ نییە و پێم دەڵێن ئاخۆ بۆچی خۆم سەرقاڵی شتی بێهودە دەکەم».

وتیشی: بۆیە بڕیارمدا چیتر وێنەکانم پیشانیان نەدەم.

دوای دڵساردکردنەوەکانی خێزانی، (سازان) بڕیاری دا ئیتر بە دزییەوە وێنە بکێشێت و وێنەکانی پیشان بە ماڵەوەی نەدات، ئەم بەهرەیەشی لە سێبەردا بشارێتەوە و نەوێرێت دەریبخات.

پاڵپشتیی نەکردنی خێزانەکان بۆ بەهرەی کچەکانیان و بە کەم سەیرکردنی بەرهەمەکانیان، وادەکات کچان ئەو بەهرەیەی هەیانە بە گرنگیی نەزانن و بە زویی دەستبەرداری بن.

سازان، تاکە کچ نیە کە بەهرەکەی خۆی لەگۆڕ ناوە، بەڵکو بەهەمان شێوە (لەنیا)ش کە ناوی خوازراوی کچێکی تری تەمەن ٢٢ ساڵە، دوای تەمەنێک لە شیعر و پەخشان نوسین، هێشتا بوێری ئەوەی نیە یەکێک لە بەرهەمەکانی پیشانی ماڵەوەیان بدات.

دەڵێت: «لە کۆی دەیان هۆنراوە کە نوسیومن، تەنها یەک دانەیانم پیشان بە خوشکە گەورەکەم داوە، کاتێک ئەویش بە بێکاریی و دەستبەتاڵی ناوی برد، بڕیارمدا چیتر پیشانی نەدەمەوە».

ئەگەر (لەنیا) و (سازان)، تەنانەت دوای دڵساردکردنەوەکانی خێزانەکەیان هێشتاش لە بەهرە و خەونەکانیان بەردەوامن، ئەوا (شەونم) لەبەر هەمان هۆکاری ئەو دو کچە، بەهرەکەی خۆی لەگۆڕ نا و چیتر لەسەری بەردەوام نەبو.

ئەو کە تەمەنی ٢٠ ساڵە، وتی: «من دەستێکی باشم لە خۆشنوسیدا هەبو، هەر لە تەمەنێکی کەمەوە چەندین وێنەم دەکێشا و خۆشنوسیم دەکرد، بەڵام کاتێک بە نرخێکی گران قەڵەمی وێنەکێشانم کڕی، دایکم گەڕاندیەوە بۆ دوکاندارەکە و پێی وتم کە وێنەکێشان بایەخی ئەو نرخە زۆرەی نیە».

وتیشی: «هەر لەوێوە من بڕیارمدا چیتر وێنە نەکێشمەوە، چونکە زانیم خێزانەکەم پاڵپشتم نابن».

ئەم رێگرییانە، بەرای مامۆستایەکی شێوەکاریی، رەنگە ببێتە هۆی چەپاندن.

سەردار حەمید، مامۆستای شێوەکاریی، وتی: «ئەو کچە بەهرەمەندە تواناکانی خۆی دەشارێتەوە، دڵنیایە لەعەقڵییەتی خێزانەکەی بۆیە ئەو کارە دەکات».

وتیشی: «ئەو کچانە ئەگەر دەرفەتیان پێبدرێت، زۆرێکیان شێوەکار و هونەرمەندی زۆرباشیان لێدەردەچێت».

تەنها خێزان نا، بەڵکو قسە و کۆمێنتە نەرێنیەکانی مامۆستایانیش کاریگەرییان بەسەر کچانەوە هەبوە بۆ ئەوەی هێندەی تر دڵسارد ببنەوە لە کارکردن لەسەر ئەو بەهرەیەی کە هەیانە.

وەک (لەنیا) دەڵێت: «من کە بێئومێد بوم لە خێزانەکەم، بڕیارم دا بەرهەمێکم پیشانی مامۆستایەکم بدەم، بەڵام ئەویش لە خێزانەکەم باشتر پشتگیرم نەبو، بەڵکو بە گرنگیی پێنەدانەوە وتی: داڕشتنەکەت هێندە بەهێز نییە، بەڵام لە هیچ باشترە. لەو رۆژەوە بڕیارمدا نوسینەکانم تەنها لەگەڵ خۆمدا بخوێنمەوە».

ئەگەر ئەو گرنگیی پێنەدانە هۆکار بێت بۆ دەستبەرداربونی کچان لە بەهرەکانیان، ئەوا توێژەرێکی دەرونی پێییوایە ئەم حاڵەتە رەنگە سەر بکێشێت بۆ پرسی تر.

بارڤا عوسمان، توێژەری دەرونی، بۆ (نەوژین) وتی: «ئەم رێگریەی خێزان و کۆمەڵگا دەبێتە هۆی ئەوەی کە کچان توشی خەمۆکی کورتخایەن یاخود درێژخایەن ببنەوە و نەتوانن بۆ بڕیاردان چیتر پشت بەخۆیان ببەستن».

# بەناوی فێربونی پیشەوە کار بە مناڵان دەکرێت

■ نەوژین، ئەسما کەریم

**ئەگەرچی تەمەنی مناڵەو هێشتا بەو رادەیە پێنەگەیشتوە، بەڵام هەمو رۆژێک (ئاکام) رو دەکاتە بازاڕ و کارکردن، لەرێگەی فرۆشتنی ئاوەوە دەیەوێت بژێویی ژیانیان دابین بکات، بۆ ئەمەش لەلایەن خێزانەکەیەوە هاندەدرێت.**

بەگشتی لە رۆژانی ئاسایی و بەتایبەتی لە رۆژانی پشوی هاوین دا، ژمارەی ئەو مناڵانەی لە بازاڕەکانی گەرمیاندا کاردەکەن، زۆر دەبن. بەشێک لەو مناڵانەی ئیش دەکەن بەبیانوی فێربونی کار، لەلایەن خێزانەکانیانەوە ئیشیان پێ دەکرێت، ئەمەش لەکاتێکدایە کە جاڕنامەکانی مافی مرۆڤ و یاساش رێگە بەو کارکردنە نادەن.

(ئاکام) بەو تەمەنە مناڵیەوە و بەدەم ماندوبون و هیلاکیەکی زۆرەوە، هاواری دەکرد «ئاو ئاوی سارد..»، ئەو کە تەمەنی ١٢ساڵە، بۆ (نەوژین) وتی: «ماوەی دو ساڵە کاردەکەم، رۆژانە لە بازاڕ دا ئاو دەفرۆشم».

وتیشی: «ماڵەوەش هانم دەدەن بۆ کارکردن، چونکە دەیانەوێت هەرلەمناڵیەوە، فێری ئەوە ببم کەبژێوی ژیانی خۆم دابین بکەم».

بەشێک لەو مناڵانەی کار دەکەن، قوتابین و لەگەڵ کارکردنیشدا ئەرکی قوتابخانەیان جێبەجێ دەکەن.

شەماڵ، ١٤ساڵ، کاری فرۆشتنی کلینسک دەکات، دەڵێت: «هەم کار دەکەم و هەمیش دەخوێنم، زۆریش حەزم لەخوێندنە، بەڵام لەبەر کەمی دەرامەتی خێزانەکەم ناچارم کار بکەم».

> مناڵەکەم کار دەکات، چونکە دەمەوێت پشت بە خۆی ببەستێت

بەپێی جاڕنامەکانی تایبەت بە مافەکانی مناڵان، مناڵ تاوەکو دەگاتە تەمەنی ١٨ساڵ، دەبێت باوک و دایک وەکو بەرپرسی خێزانەکە بژێوی دابین بکەن، بەڵام بەشێک لەو مناڵانەی کاردەکەن، بەپێچەوانەوە لەلایەن باوکان و خێزانەکانیانەوە رەوانەی بازاڕەکان و ناو ئیشکردن کراون.

محەمەد، ناوی خوازراوی باوکێکە کە کوڕە مناڵەکەی کار دەکات، بۆ (نەوژین) دوا: «مناڵەکەم کار دەکات، چونکە دەمەوێت هەر لەتەمەنێکی بچوکدا فێری ئەوە بێت کە پشت بەخۆی ببەستێت و ئەرک و بەرپرسیارێتی خۆی بزانێت».

بەڵام بەپێچەوانەی ئەم باوکە، بەشێک لەباوکان نایانەوێت بەهیچ جۆرێک مناڵەکانیان بخەنە ناو کار و کاسبییەوە.

دلێر عەبدولڕەحمان، کە باوکی مناڵێکە، وتی: «قەت رێگە بەخۆم نادەم کار بەمناڵەکەم بکەم، مناڵ دەبێت چێژ لەمناڵی خۆی ببینێت نەک بخرێتە بەر کار».



ژمارەیەک مناڵ لە کەلار کلێنکس لەسەر شەقامەکان دەفرۆشن    فۆتۆ: ئاسیا حسێن

وتیشی: مناڵ نابێت کاری پێ بکرێت، چونکە لە روی پەروەردەییەوە گونجاو نییە و زیانی بۆ سەر کەسایەتیی دەبێت لە ئایندەدا.

رونیشیکردەوە کە لە بازاڕەکاندا مناڵان بەو تەمەنە کەمەیانەوە تێکەڵ بەکەسانی لەخۆیان گەورەتر دەبن، کە ئەمەش گونجاو نییەو کار دەکاتە سەر رەفتاریان و کاریگەریەکی نەرێنی لەسەر کەسایەتی مناڵ دروستدەکات.

هەر چەندە بەپێی یاسای بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی خێزانی لە هەرێم و یاسای نەوجەوانی لە عێراق، هەر دایک و باوکێک مناڵ ناچار بەکارکردن بکات ئەوا وەک ئەوەیە تاوانێکی ئەنجام دابێت، بەڵام تاوەکو ئێستا یاساش نەیتوانیوە رێگە لەکارکردنی مناڵان بگرێت.

نەشاد عومەر، پارێزەر، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «بەپێی یاسا کارپێکراوەکان، مناڵ لەخوار تەمەنی ١٥ساڵەوە رێگەپێدراو نیە و ناتوانێت کار بکات، لەسەروی ١٥ بۆ ١٨ساڵ دەتوانێت کار بکات، بەڵام بەومەرجەی ئەو کارەی کەدەیکات لەگەڵ بەرژەوەندی و تەندروستی و پەروەردەی مناڵەکەدا بێتەوە».

# 8 هەڵە لە پەروەردەکردنی مناڵ دا



■ نەوژین

**پەروەردەکردنی مناڵ، پرۆسەیەکی ورد و ئاڵۆزەو پێویستە دایکان و باوکان بەهەندی وەربگرن، چونکە ئەو وردەکاریانەی تەمەنی مناڵی، هەموی لەسەر کەسایەتی ئەو مناڵە رەنگ دەداتەوە چ لە تەمەنی مناڵی و چ پاش گەورە بونی.**

لە خوارەوەش، ٨ خاڵ خراونەتە رو کە خۆی لە خۆی دا ٨ هەڵەی زەق و دیارن کە دایکان و باوکان دەیکەن و کاریگەریی خراپیی دەبێت بۆسەر کەسایەتیی و پەروەردەی مناڵ.

**١. پیاهەڵدان و خەڵاتکردنی بەردەوام**

هەندێک لە دایکان و باوکان بەو پاساوەی هانی مناڵەکانیان دەدەن، بۆ هەمو کار و رەفتارێک، دەستخۆشیی لە مناڵەکانیان دەکەن یان خەڵاتیان دەکەن، تەنانەت ئەگەر ئەو کار و رەفتارەش ئاسایی یان هەندێجاریش راست نەبێت.

ئەم کارەش هەڵەیەو خراپە، چونکە وادەکات مناڵەکە لەهەمو کارێک دا کە دەیکات، چاوەڕێی دەستخۆشیی و پیاهەڵدان و ستایش بێت، تەنانەت ئەگەر کارەکەش زۆر بێبایەخ بێت، واش دەکات مناڵەکە لەبەر خاتری ئەو پیاهەڵدان و خەڵاتکردنانە ئیش و رەفتار بکات.

**٢. بەراورد کردن**

بەراورد کردنی مناڵ بە مناڵی دیکە،کارێکی هەڵەیە کە هەندێک لە دایکان و باوکان دەیکەن و کەسایەتی مناڵەکە دەشێوێنێت و وادەکات هەست بە کەمیی بکات.

هەمو مناڵێک تایبەتمەندیی خۆی هەیە و مەرج نییە لە مناڵێکی تر بچێت، ئەرکی دایکان و باوکان ئەوەیە ئەم تایبەتمەندیەی مناڵەکەیان بدۆزنەوەو گەشەی پێبدەن، نەک بەراوردیان بە مناڵی تر بکەن.

**٣. دڵخۆشکردنی مناڵ**

دەبێت لێگەڕێین مناڵ خۆی هۆکاری دڵخۆشیی خۆی بدۆزێتەوە، نەک بەپێچەوانەوە دایک و باوک بە بەردەوام هەوڵی دڵخۆشکردنی مناڵەکەیان بدەن و وا بزانن ئەرکی سەرەکییان دڵخۆشکردنی مناڵە، چونکە ئەم دڵخۆشکردنە هەندێکجار وای لێدێت کە مناڵەکەت ناچار بکەیت دڵخۆش بێت!

**٤. هەڕەشەو ئاگادارکردنەوە**

هەرگیز نابێت دایکان و باوکان وا لەمناڵ بگەیەنن کە بەهۆی رەفتارێکیانەوە خۆشیان ناوێت، یان وای لێبکەن هەست بە تاوان بکات. ئەم کارە رەنگە بۆماوەیەکی کاتیی مناڵ ناچار بکات بەقسەی دایک و باوکی بکات و بێتە ژێر رکێفیانەوە، بەڵام لە دور مەودا دا بێمتمانەیی و خۆخواردنەوەی تیادا دروست دەبێت و کاریگەریی خراپی بەسەر کەسایەتییەوە دەردەکەوێت.

**٥. نازپێدان و پاراستنی زیاد لە پێویست**

هەندێک لەدایکان و باوکان، بەشێوەیەک مناڵەکانیان پارێزراو دەکەن، کە لەبری ئەوان خۆیان هەڵدەستن بە زۆر کار و بار، ئەمەش لەترسی ئەوەی نەکا مناڵەکە روبەڕوی کێشە و روداو یان پێشهاتێکی ناخۆش و خراپ ببێتەوە. بەڵام ئەم کارە وادەکات مناڵ نەتوانێت ببێتە خاوەنی بڕیاری خۆی و وای لێبێت لەبری خۆی پشت بەکەسانی تر ببەستێت.

هەروەها نازپێدانی زۆر بە مناڵ، وادەکات مناڵەکە کێشەی هەبێت لە دروستکردنی پەیوەندیی لەگەڵ دەوروبەر و نەشتوانێت بەباشیی روبەڕوی ئاستەنگەکانی ژیان ببێتەوە.

> توندوتیژی وا لە مناڵ ناکات بە خۆی دا بچێتەوە

**٦. توندوتیژی**

ئەگەرچی هەمو توێژینەوە پەروەردەییەکان هانی باوکان و دایکان دەدەن بۆ دوربون لە توندوتیژی، بەڵام باوکان و دایکان هەر دوبارە پەنای بۆ دەبەنەوە. کێشەکە ئەوەیە رەنگە توندوتیژیەکە بۆ ماوەیەکی کاتیی رەفتاری مناڵەکە بگۆڕێت، بەڵام هەرگیز وای لێناکات بەتەواوی بەخۆی و رەفتارەکانی دا بچێتەوە، هەروەک وادەکات مناڵەکە لەروی پەروەردەییەوە تێکبچێت و متمانەیشی بەخۆی نەبێت و کەسێکی لاسار دەربچێت.

**٧. جیاوازی رای دایکان و باوکان**

زۆجار هاوسەرەکان لەکاتێکدا یەکێکیان سزای مناڵەکە دەدات یان رەفتارێکی لەگەڵ دەکات، ئەوی دیکەیان هەوڵی شکاندنی سزاکەی دەدات.

ئەم کارە مناڵەکە فێری درۆ و فێڵکردن دەکات. جگە لەوەی ئەم دو هەوا کەوتنە، وادەکات مناڵ لاسەنگ بێت لە راگرتنی باڵانس لەنێوان دایک و باوکی و زۆرتر گرنگیی بەو لایەیان بدات کە لێبوردەترە.

بۆیە واباشترە دایکان و باوکان یەک دەنگ بن لەکاتێکدا لێپێچنەوەو سزای مناڵەکەیان دەدەن، واباشتریشە ئەگەر ئەمجارە باوکەکە سزای مناڵەکەی دا، جاری داهاتو دایکەکە ئەو کارە بکات، بۆئەوەی مناڵەکە هەست بە ناهاوسەنگیی نەکات.

**٨. ناجێگیربون لەسەر جۆری رەفتارەکان**

زۆرجار دایک و باوک لەمامەڵەیان لەگەڵ رەفتارەکانی مناڵەکەیان، یەک شێوە بڕیار نادەن، واتا بۆنمونە لەسەر رەفتارێکی خراپ، جارێک سزای دەدەن، کەچی جارێکی تر لێی دەبورن و جارێکی تر هەر گوێی پێنادەن.

ئەمەش وادەکات بیری مناڵەکە پەرت بێت و نەشزانێت چی باشە و چی خراپە.

بۆیە پێویستە هەموکات هەڵوێستمان لەبارەی رەفتارە هەڵەکانەوە، وەک یەک و یەک جۆر بێت.

سەرچاوە: www.supermama.me

# بۆ کارکردن ژنان شەو و ڕۆژ ناناسن

**▪ نەوژین،**
**هاوژین مەهدی– ئەژین مەهدی**

**هەمو شەوێک (شاهان) وەک هەر کاتێکی تری ئاسایی ڕۆژ، کارەکانی فرۆشگاکەی بەباشیی بەڕێوەدەبات، ئەگەرچی لە کۆمەڵگاکەی دا بۆ ڕەگەزەکەی ئەو پەسەند نییە بە شەوان دەربچێت چ جای ئەوەی کار بکات.**

شاهان، نمونەیەکە لە ژمارەیەکی زۆرتری ئافرەتان کە شەوانە لە فرۆشگا و شوێنکارە جیاوازەکانی کەلار دا کاردەکەن، لەهەنگاوێکدا کە پێشتر زۆر دەگمەن و سنوردار بو.

لەگەڵ پەرەسەندنی بەشداریی ژنان لە بواری کارکردن دا، لەئێستادا بەشێکی بەرچاو لەوان ئەو ئاستەنگانە دەشکێنن کە پێشتر لەرێگەی کارکردنیان دا هەبوە، یەکێک لەوانەش: کارکردن بو بە شەوان.

ئێستا شەوان ژمارەیەکی بەرچاو لە ژنان لە شوێنکارەکان دا، کاری رۆژانەو ئاسایی خۆیان دەکەن.

شاهان مەجید، ٢٢ ساڵ، یەکێکە لەو کچانەی کە بەشەوان کار دەکات، نایشارێتەوە لەسەرەتاوە باوکی بە کارکردنی شەوانی رازیی نەبوە، بەڵام دواتر توانیویەتی لەگەڵ دایکی قەناعەتی پێبێنێت کە شیاوە بۆ ئەو متمانەو بەرپرسیارێتییە.

باس لەوە دەکات سەرباری ئەوەش هەندێک کەس بە شتێکی نامۆ لە ئیشکردنی ئافرەتان دەڕوانن و بە پێکەنینەوە وتی: «کڕیارەکان وا دەزانن خەڵکی ئێرە نیم».

لەوەتەی قەیرانیی دارایی روبەڕوی هەرێم بوەتەوە، رێژەی کارکردنی ژنانیش زیاتر بوە، هەر ئەم هۆکارەش بەرای چالاکوانێکی ژنان، وایکردوە ژنان بەهۆیەوە بەربەستی کارکردن بە شەوانیش بشکێنن.

لەیلا ئەحمەد، چالاکوانی ژنان، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «لەگەڵ هاتنی قەیرانی دارایی دا ئافرەتان زیاتر رویان لە ئیشوکاری دەرەوە بە رۆژ و شەو کردوە».

وتیشی: «لەچاو ساڵانی پێشودا خەڵک تارادەیەک ئاستی هۆشیاری بەرز بوەتەوە و خێزانەکان و تاکی مێش بونی ئیش و داهاتی تایبەت بە پێویست دەزانن، هەر ئەمەش وایکردوە بتوانن سەرکەوتو بن لەم هەنگاوەیان دا».

وادیارە ئەم تێگەیشتن و کرانەوەیەی خێزانەکان وەک چالاکوانەکە باسی لێوەدەکات، رۆڵی هەبوە لەوەی ژنان بتوانن تەنانەت لە شەوانیش دا کار بکەن و خێزانەکانیش پاڵپشتییان بکەن.

> ئەگەر پاڵپشتی هەبێت جیاوازی نییە شەو یان رۆژ ئیش بکەیت

دیانا حسێن، ٢٢ ساڵ، بە شەوان کاری کاشێریی دەکات، بۆ (نەوژین) وتی: «ئەم ئیشەم هەڵبژاردوە بۆ ئەوەی شتی زیاتر فێر بم و کاتم بە فیرۆ نەڕوات، ئەگەر پاڵپشتی هەبێت جیاوازی نییە شەو یان رۆژ ئیش بکەیت».

دەشڵێت: بە ئیشەکەم ئاسودەی و دڵخۆشی زۆری پێ بەخشیوم، چونکە زۆر کچیش بەهۆی منەوە هاتون و ئیشیان کردوە بە شەوان.

هەندێک لەئافرەتان پێیانوایە ئەگەر ئافرەت کەسێکی خۆی لەگەڵ بێت لەکارکردنی شەوان دا، سەرکەوتو ترە.

نیگار عومەر، ماوەی چوار ساڵە لەگەڵ مێردەکەی ئێشگری دەکات لەیەکێک لە نەخۆشخانە حکومییەکان، وتی: «ئافرەت ئەگەر هاوسەر یان برا و باوکی لەگەڵ بێت لەئیشەکەی دا، ئەوا سەرکەوتو تر و ئاسانترە بۆی».

بەڵام (سارا) بە پێچەوانەوە ئاماژە بەوەدەکات کە کچ بۆ سەرکەوتنی لە ئیشوکاردا، پێش هەر شتێک پێویستی بە هێز و توانای خۆی هەیە.

ئەو ئەگەرچی هێشتا خوێندکاری زانکۆیە، بەڵام کاری ریکلام و وێنەگرتن دەکات، وتی: «ژن ئەگەر خاوەنی هێزو توانای خۆی بێت بە تەنیاش دەتوانێت سەرکەوتو بیت».

> ژن خاوەنی هێز و توانای خۆی بێت بە تەنیاش سەرکەوتو دەبیت

سەرباری ئەمەش، ئافرەتان نایشارنەوە کە کارکردنی شەوان، بێ ئاستەنگ و کێشە نییە.

سارا، بۆ (نەوژین) وتی: «ئاستەنگی زۆرمان دێتە پێش وەکو کچ کە بەشەوان کار دەکەین، لەلایەن رەگەزی بەرانبەرەوە کارەکەمان بەکەم سەیر دەکەن، بەڵام ئێمە گوێ بەوانە نادەین و بەردەوامین».

بە باوەڕ بەخۆبونێکیشەوە وتی: «من وەکو کچێک تەنها دەمەوێت ئومێدێک بنیات بنێم لەم کۆمەڵگا زیندو کوژ مردو پەرستەدا».

---

# هەم کاردەکەن هەم دەخوێنن

**▪ نەوژین، فاتمە جومعە**

**بەشێک لە کچان لەپاڵ بەردەوامبون لە خوێندن دا، سەرقاڵی کارکردنن، ئەمەش لەلایەک دەستگرۆیی کردون بۆ ئەوەی باشتر خوێندنەکەیان تەواو بکەن، لەلایەکی تریشەوە ئەزمونێکی زیاتریان پێدەبەخشێت.**

کچانی خوێندکار و کرێکار، باس لەوە دەکەن کە بەم دو کارکردنەیان، دەیانەوێت بارگرانیی نەبن بەسەر خێزانەکانیانەوەو باشتریش بتوانن پێداویستییەکانی خۆیان دابین بکەن.

باخان-ی تەمەن٢١ ساڵ، لەگەڵ ئەوەی لەپۆلی ٩ بنەڕەتیەوە دەستی بەکارکردن کردوە، ئێستا قۆناغی ٣ی ئامادەیی بازرگانیە و تاکو ئێستاش هەر بەردەوامە لەکارکردن.

باسی ئەزمونی کار و خوێندنی خۆی بەمشێوەیە بۆ (نەوژین) کرد «لەدوای ئەوەی لەپۆلی ٩ بەکاری درومان دەستم پێکرد، بۆ ماوەیەک ئەوکارەم کرد، بەڵام هەستم دەکرد دەمبەستێتەوە بەماڵەوە، بۆیە بڕیارم دا دەست بە کارکردن بکەم لەدەرەوەی ماڵ، تاکو ئێستا چەند کارێکم تاقیکردوەتەوە لەسوپەرمارکێت و ئاریشتگا و چەند شوێنێکی تریش».

بەشیکی تری کچان لەپێناو بەردەوابونیان لەخوێندن و دابینکردنی تێچونی خوێندنەکەیان، کاردەکەن.

هەڵاڵە عەلی، ٢٤ ساڵ، یەکێکە لەو کچانەی کە بۆ بەردەوامبونی لەخویندن کاردەکات. وتی: »لەدوای ئەوەی لەپەیمانگای کۆمپیوتەر پلەی یەکەمم بەدەست هێنا، دەمتوانی بەردەوام بم لەخوێندن، بەڵام بەهۆی قەیرانی داراییەوە نەمتوانی لەکاتی خۆیدا دەست بەخوێندن بکەم».

ئەو کچە ساڵی پار لەبەشی زانستی کۆمپیوتەر لە زانکۆی گەرمیان لە بەشی ئێواران دوبارە دەستی بەخوێندن کردوە «چونکە لەکاتی خۆیدا دەستم بەخوێندن نەکرد، ئێستا بە ئێواران دەخوێنم و بۆ خویندنەکەم پێویستم بە پارەیە، هەربۆیە کاردەکەم و جگە لەو هۆکارەش خۆم حەزم لەکارکردن و پشت بە خۆ بەستنە».

(هەڵاڵە) و (باخان)، هەردوکیان بەپاڵپشتی خێزانەکانیان بەردەوامیان بەکارکردن داوە.

(باخان)، بەمجۆرە باسی هاوکاری و پشتیوانی کەسوکاری دەکات بۆ کارکردن: «ئێستا لەیەکێک لە ساردەمەنیخانەکان کاری شاگردی دەکەم و بەردەوامیشم، چونکە زۆر حەز بە یارمەتیدانی ماڵەوە دەکەم و پاڵپشتی خێزانەکەم هانی زیاترم دەدات، لەنێو خیزانەکەشمدا باوکم باشترین پاڵپشتی منی دەکرد».

هەڵاڵە-ش، بەم جۆرەباسی خێزان و کاریگەری لەسەر خۆی و کارکردنی دەکات: «لەگەڵ ئەوەی من ئێستا هەم لەکەرتی تایبەت و هەم لەکەرتی حکومی کاردەکەم و دەخوێنم، بۆیە زۆرجار کاتم کەمە، بەڵام خێزانەکەم زیاتر هێزی بەردەوامیم پێدەبەخشن وهاوکاریم دەکەن».

بەشێک لەو کچانەی کە کاردەکەن، خوێندکاری زانکۆن و هەندێکیان لە بەشە ناوخۆییەکان دەمێننەوە، ئەمەش ئەرک و بارگرانی زۆری هەیە، بەڵام وای لێنەکردون واز لەکارکردن بهێنن.

کەژی، ناوی خوازراوی کچێکی تەمەن ٢٢ ساڵی دانیشتوی کەلارە، لە زانکۆی سلێمانی دەخوێنێت و هەر لەو شارەش کار دەکات.

> کارکردن بۆ ئافرەت هیچ شەرم و عەیبەیەکی تیدا نییە

وتی: «لەماوەی ئەوەی لە بەشە ناوخۆیی دەمامەوە زۆر کارم دەکرد، بەتایبەت لەنێو بەشەکەدا کاری فروشتنی کەرەستەی جوانکاریم دەکرد، بەشێوەیەک بەپێی خواستی کڕیار و بەنرخێکی کەمتر لەبازاڕ کەرەستەکانم دەفرۆشت».

وتیشی: «قورس بو بۆم، چونکە مانەوە لە بەشە ناوخۆیی و کارکردن شتێکی ئاسان نییە، بەڵام توانیم کاربکەم و بەردەوام بم، دڵخۆشیش بوم بەوەی ئەرکی سەرشانی خێزانەکەم کەم بکەمەوە».

(کەژی) لایوایە کارکردن بۆ کچان و ژنان سودی زۆرە و دەلالەتە لە «بەرەوپێشچون و بەردەوامیی».

وتی: «دەمەوێت خەڵک لەوە بگات کارکردن بۆ ئافرەت هیچ شەرم وعەیبەیەکی تیدا نییە».

# بژار.. کچە گوندییەکی ئەندازیار



یەکێک لە کارەکانی (بژار محەمەد)

■ نەوژین، لەیلا ئەحمەد*

**بەبێ ئەوەی ئەندازیار بێت یان خوێندکاری ئەندازیاریی بێت، (بژار) لە گوندەکەی خۆیان سەرقاڵی دروستکردنی جوانکاریی ئەوتۆیە کە مەگەر هەر ئەندازیار و کەسانی کارامە دەستیان بەسەریدا بشکێت و بتوانن دروستی بکەن.**

بژار محەمەد مەحمود، ٢٧ ساڵ، دەرچوی پەیمانگای بەشی کارگێڕییە، ئەو ئێستا وەکو وانەبێژ لە گوندەکەی خۆیان (بێلولە) لە ناحیەی (مەیدان)، وانەی بیرکاریی دەڵێتەوە.

لەپاڵ ئەم کارە سەرەکیەدا، ئەو کچە بەهرەیەکی تایبەتی هەیە لە بواری جوانکاریی بەرد و دیزاینکردنی باخچە و دروستکردنی دیواری جوانکاریی و نافورەی ئاو و هاوشێوەکانی، ئەم کارەشی بە کەرەستەی سەرەتایی و سادە دەکات.

بژار، دەربارەی پیشەکەی دەڵێت: «لەمناڵیەوە ئارەزوم ئەم کارەم بوە، هەرچەندە بەهۆی خوێندن نەمتوانی بەردەوام بم لە پیشەکەم، بەڵام کەخوێندنم تەواو کرد سەرەتا بەشتی بچوک دەستم بە کاری بەرد نەخشاندن و دروستکردنی کورسی و مێزەکان کرد».

لەسەرەتادا ئەم کارە وەکو خولیایەک لای ئەو کچە پەرەی سەندوە، پاشان بوەتە پیشەیەک و ئێستاش وەکو سەرچاوەیەکی داهات کەڵکی لێوەردەگرێت.

بژار، زیاتر لەسەر پیشەکەی دواو وتی: «کەرەستە سەرەتاییەکانی کارەکەم لەبازاڕ دەکڕم، کارەکەم هەندێک زەحمەتە، چونکە من لەگوندم و بۆ کڕینی کەرەستەکانی وەکو: بلۆک، چیمەنتۆ، وردە بەردە ڕەنگاوڕەنگەکان، خشتی سور و شتومەکی تر، دەبێت بڕۆمە بازاڕی شار و کارگە و کۆگاکان».

جگە لەگۆڕینی کەرەستەی سەرەتایی بۆ ڕازاندنەوەی ماڵ، (بژار) شتومەکە کۆنەکان وەک تایە و دار و شتی تر کۆ دەکاتەوە و بۆ دروستکردنی بەرهەمی دیکە سودیان لێوەردەگرێت.

بژار، بەهرە ئەندازیارییەکەی لەبواری نەخشاندن و دروستکردندا تەنها لەلای خۆی نەهێشتوەتەوە، بەڵکو بۆ ئەندامانی خێزان و دەروبەرەکەیشی گواستوەتەوەو ئێستا پێکەوە لەم بوارەدا کاردەکەن.

لەوبارەیەوە وتی: «هەرچەندە باوکم مردوە، لە ڕێگەی دایک و برا و خۆشکەکانمەوە توانیم پەرە بەکارەکانم بدەم و لەپیشەیەکی سادەوە بۆ پرۆژەیەکی گەورەتر دەستم پێکرد».

بەهیە، دایکی بژار، خۆشحاڵە بەو کارامەییەی کە کچەکەی هەیەتی، باسیلەوەشکردوە کە هەر لەسەرەتاوە هاوکاریی بون و بۆ داهاتوش هەر هاوکاری دەبن.

وادیارە ئەم هاوکارییە بەردەوامەی خێزانەکەی، لێکەوتەی باشیی هەبوە، وەک (بژار) دەڵێت: «ئەگەرچی هەندی بەربەستم لەبەردەمدایە و قەیرانە و تێچوی کڕینی کەرەستەکان و هێنانیان بۆ گوند زۆرە و دایکیشم نەخۆشە و تەنیا کچی ماڵم، بەڵام پشتیوانییە بەردەوامەکانی خێزانەکەم وایکردوە بەردەوام لە کارەکەمدا بچمە پێشەوە و بیرۆکەی باشترم هەبێت».

لەبارەی نرخی کارەکانیەوە، (بژار) ڕونیدەکاتەوە کە زۆرتر کەرەستە سروشتیەکان بەکاردێنێت، ئەمەش لەلایەک بۆ ئەوەی ڕەنگی کەرەستەکان وەکخۆیان بن و دەستکرد دەرنەکەون، لەلایەکی تریشەوە تێچوی زیاد نەکات بۆ ئەوەی بەنرخێکی گونجاو بە کڕیارانی بفرۆشێتەوە.

ئەو ئەگەرچی لە گوندێکی دورە شارە، بەڵام سودی لەتەکنەلۆژیا بینیوە بۆ پەرەدان بەکارەکانی و ئینتەرنێت وەکو سەرچاوەیەک بۆ پەرەدان بە بیرۆکەو دیزاینەکانی بەکار دەهێنێت.

هیواخوازیشە ئەم بەهرەیەی هەیەتی، لەگەڵ کچانی دیکەدا ئاڵوگۆڕ پێبکات و لەڕێگەی دروستکردنی گروپێکەوە، کارەکەیان جوان و تۆکمەتر و بەرەوپێش ببەن.

* ئەندامی تیمی ڕێکخراوی وادی ئەڵمانی لەگەرمیان

# لە کەلار بۆ یەکەمجار کچێک دوکانی «جملە فرۆشیی» بەڕێوە دەبات



■ نەوژین، ئەسما کەریم

**(شەیما) دەبێت بە یەکەم کچ کە دوکانێکی کۆ فرۆشتنی (جملە) تایبەت بە جوانکاری و جلی ئافرەتان، لە شاری کەلار بەڕێوەببات.**

ئەم کچە (جملە) فرۆشە، هەم کارێکی جیاواز لەو کارانەی کە ئافرەتان دەیکەن هەڵبژاردوە، هەمیش هانی ئافرەتان دەدات کە بتوانن بێنە بازاڕی کارەوە و ببن بە خاوەن کار و داهاتی سەربەخۆی خۆیان.

شەیما عەدنان، ٢٣ ساڵ، خاوەن بروانامەی دیبلۆمە لە شیکاری نەخۆشیەکان، بەڵام بوارێکی بۆ کارکردن دۆزیوەتەوە کە دور و جیاوازە لەو پسپۆڕێتییەی بۆی خوێندوە.

ئەو باس لە سەرەتاکانی دەست پێکردنی لەم کارەی دا دەکات، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «بە هاوبەشی ئەم دوکانەمان داناوە و لەسەرەتا کاتێک دەستم بە کار کرد سەردانیکەران زۆریان پێ سەیر بو کچێک ئەم دوکانە بەڕێوە دەبات، چونکە من یەکەم کچ بوم کە فرۆشگایەکی وەها لەنێو بازاڕدا بەڕێوە ببەم».

(شەیما) بەم کارەی زۆر دڵخۆشە، چونکە وەک خۆی هێمای بۆ کرد، ئەم پیشەیەی زۆر نزیکە لە ئافرەتەوە و زۆرینەی ئەو بابەتانەی لەنێو فرۆشگاکەدا هەن، پێداویستی ئافرەتانن.

ئەم کچە پێیوایە کاتی ئەوە هاتوە ئافرەتان لەماڵەوە بێنە دەرەوە و کاری خۆیان یان هەبێت و بژێوی خۆیان پەیدا بکەن بۆ ئەوەی چاوەڕێی دەستی باوک و هاوسەرەکانیان نەبن , وتی: «چونکە ئابوری سەربەخۆی ژنان وادەکات کە ئافرەتان هەنگاوێکی زیاتر بنێن لە ژیانیاندا».

زۆرێک لە کچان کە دەیانەوێت کارێک بکەن بەتایبەت کارێکی جیاواز لەوەی کۆمەڵ پێی ڕاهاتوە ژنان بیکات، ڕوبەڕوی ئاستەنگ دەبنەوە.

شەیما، دان بەوەدا دەنێت کە لەسەرەتاوە لەلایەن خێزانەکەیەوە بیرۆکەکەی پەسەند نەکراوە و ڕێگری و کۆسپ هەبوە، بەڵام ئەو کۆڵی نەداوە و بەردوام بوە لەکارەکەیدا، چونکە وەکخۆی وتی: «ئەگەر ئافرەتان لەسەر ئەو کارەی هەڵی دەبژێرن بەردەوام بن، هەم بۆ خێزان و هەمیش بۆ کۆمەڵگای دەسەلمێنن کە ئافرەت دەتوانێس هەمو کارێک بکەن».

وتیشی: «لەگەڵ بەردەوام بونم لەم پیشەیەدا توانیم بۆ خێزانەکەمی بسەلمێنم کە ئافرەتیش دەتوانێت هەمو کارێک ئەنجام بدات».

ئەم کچە فرۆشیارە جیاواز لەوەی ئەم کارە دەکات، کار لەبواری ئەو بەشەش دەکات کەلەخوێندا تەواوی کردوە، دەڵێت: «ماوەی چوار ساڵە لە بەشی تاقیگەی نەخۆشخانەی شەهید شێرەی نەقیب وەکو خۆبەخش کار دەکەم».

> توانیم بیسەلمێنم ئافرەتیش دەتوانێت هەمو کارێک ئەنجام بدات

لەکاتی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەی (نەوژین) دا لەگەڵ ئەم کچە «جملە فرۆشە»دا، کڕیاران بە بەردەوامی هاتوچۆی ناو دوکانەکەیان دەکرد و سەودای نرخی شتومەکەکانیان دەکرد و هەندێکیشیان لێیان دەکڕی.

دەرفەتمان قۆستەوە و لەگەڵ چەند ژنێکی کڕیار قسەمان کرد لەبارەی ڕاوبۆچونیان لەسەر پرۆژەکەی (شەیما).

ئامینە، یەکێک بو لەو ژنە کڕیارانە، وتی: «زۆر ئاسودەم کە دێمە ئێرەو شت دەکڕم، چونکە بە ئازادییەکی زیاترەوە دەتوانم ئەوەی دەمەوێت بیکڕم و مامەڵەی بکەم».

شەیدا، کە کچە کڕیارێکی تر بو، هەمان هەستی (ئامینە)ی هەیە و هیواشی خواست هاوشێوەی لە بازاڕدا زۆر بێت.

## دایکایەتی رێگەی هونەری لێ نەگۆڕیوە

# یوسرا عەلی: هونەرەکەم لە هەمو شتێک گرنگترە و ناتوانم دەستبەرداری بم



■ نەوژین، شەیما مەحمود

**رەنگە زۆرین ئەو ژنانەی لە دوای چونە ژیانی هاوسەرگیرییەوە لە خەون و خولیاکانیان دوردەکەونەوە، بەڵام (یوسرا) هاوسەرگیری ئەو رێگەی لێ نەگۆڕیوە و بەردەوامە لە پەرەدان بە توانکانی و وەکو یەکێک لە شێوەکارانی ژن لەگەرمیان، چالاکیی ئەنجام دەدات.**

یوسرا عەلی، بەهرەمەندێکی بواری شێوەکارییە و لە ساڵی ١٩٩٤ لەشاری کەلار لە دایک بوە و دەرچوی بەشیی شێوەکاری پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کفرییە.

ئەو لەگەڵ ئەوەی هاوسەرگیری کردوە و ئەرکی دایکایەتی لەسەر شانە، بەڵام لە کارە هونەرییەکانی دورنەکەوتوەتەوە و وەکخۆی بۆ (نەوژین) دوا و وتی: «حەزو ئارەزویەکی زۆرم بۆ کاری هونەری هەیە بەتایبەتی وێنەکێشان».

باس لەوەشدەکات کە نزیکەی ٣٥ی تابلۆی هەیە و بەشێک لە تابلۆکانیشی فرۆشتوە «من بە بەردەوام بەشداریی لە چالاکییە هونەرییەکان دا دەکەم و تائێستاش بەشداری زیاتر لە ٤٠ پێشانگام کردوە، هەروەک بەشێک لە تابلۆکانیشم فرۆشتوە».

هۆکاری بەردەوامی (یوسرا) لەسەر کارە هونەرییەکانی وەکخۆی دەڵێت هاوسەرەکەیەتی بەو پێیەی پاڵپشتی بەردەوامیەتی «خێزانەکەم هاوکارێکی باشی منن و یارمەتیم دەدەن لە بەردەوام بون لەکاری هونەریی، بە تایبەت هاوسەرەکەم کە وایلێکردوم بگەم بە خەونەکانم».

زۆربەی ژنانی هونەرمەند، لەگەڵ پێکهێنانی خێزان و خستنەوەی منداڵ دا، ئەو گەرموگوڕییەی کە هەیانە لەکاری هونەریی، لەلایان سارد دەبێتەوە و نامێنێت.

بەڵام (یوسرا)، ئاماژە بەوە دەکات کە ئەگەرچی ئێستا ئەرکی قورسترە، بەڵام ئەمە واینەکردوە کە دەستبەرداری کارە هونەرییەکانی ببێت.

ئەو راگرتنی هاوسەنگی لە نێوان کاری ماڵ و کارە هونەرییەکانی بە قورس ناودەبات و ئاماژە بەوەدەکات لە پاڵ کارەکانی ماڵەوە کاتی بەتاڵ پەیدا دەکەم و کارە



هونەرییەکانیش بەرێ دەکەم، بەڵام ئەگەر پشتگیری خێزان نەبێت کارێکی ئاسان نیە «هەرگیز نەمهێشتوە هیچ شتێک ببێتە رێگر لەبەردەم کارە هونەرییەکانم، هەرچەندە من دایکم و کارەکانم زەحمەتە، بەڵام توانیومە دایکایەتی خۆم بسەلمێنم و بەسەر رێگرییەکاندا زاڵبم».

یوسرا، یەکێکە لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەرانی گروپی کیژانی شێوەکاری کفری، کە گروپێکە لە چەندین شێوەکاری ئافرەت پێکهاتوە لە کفری و ناوچەکانی تری گەرمیان، تائێستاش لەو رێگەیەوە کومەڵێکی بەرچاو کاری هونەری ئەنجامداوە.

ئەو کارەکانی لە نێو هەرێمدا نەهێشتوەتەوە و لە ماوەکانی پێشودا بەشداری پێشەنگایەکی کردوە لە نێو پەرلەمانی عێراق.

خەمەکانی ئەم ژنە شێوەکارە، زۆرتر مرۆیین و ویستویەتی چ لە رێگەی وێنەکێشان و چ لەرێگەی دیکەوە، هاوکار بێت بۆ باشترکردنی رەوشی مرۆڤەکان، لەمچوارچێوەیەشدا لە رێگەی هونەرەکەیەوە خزمەتی ئاوارەکان دەکات و لەگەڵ رێکخراوی یونسێف دا کاردەکات و وانەی هونەر بە منالی ئاوارە دەڵێتەوە.

یەکێک لە دیارترین کێشەکانی هونەر لە کوردستاندا ئەوەیە، کە کەمجار دەبێتە سەرچاوەی داهات و بژێویی هونەرمەند، واتا ئەو کارانەی هونەرمەندەکە دەیکات، زۆر کەم دەبنە هۆی ئەوەی بژێویی دابین بکەن، هەربۆیە ناچارن لەپاڵ کاری هونەریی دا، کاری دیکە بکەن.

لە بارەی ئەوەی تا چەند هونەر توانیویەتی سەرچاوەی دارایی و بژێویی ژیانی دابین بکات، (یوسرا) ئاماژە بەوەدەکات کە نەیتوانیوە ببێتە ئەو سەرچاوەیە.

بەڵام ئەو ژنە هونەرمەندە، رایوایە ئەگەرچی هونەر بۆ بژێویی زۆر بە کەڵکی نەهاتوە، بەڵام توانیویەتی لایەنی رۆحیی بە باشیی بۆ پڕ بکاتەوە.

وتی: «هونەر نەبوەتە سەرچاوەی دارایی لای من، بەڵام لایەنی رۆحی منی بەرەو لوتکەی سەرکەوتن بردوە».

وتیشی: «راستە لایەنی دارایی گرنگە، بەڵام لای من هونەرەکەم لە هەمو شتێک گرنگترە و ناتوانم دەستبەرداری بم».



# ئاسیا تۆفیق وەهبی... رۆشنبیرە گومناوەکە

■ نەوژین

**یەکێکە لە سەرەتایی ترین ئەو ژنانەی لەعێراق لەسەر پرسی مافەکانی ژنان هاتوەتە دەنگ و نوسیویەتی، رۆڵی لە دروستکردنی چەندین کۆمەڵە و رێکخراوی داکۆکیکار لە ژنان دا هەبوەو خۆیشی سەرۆکایەتی یەکەمین یەکێتی ژنانی لە عێراق دا کردوە. ئەوەی باسی دەکەین خاتو (ئاسیا تۆفیق وەهبی)یە.**

تۆفیق وەهبی بەگ، ناوێکی ئاشنا و ناسراوی مێژوی کوردە لە سەدەی ٢٠ دا، ئەو جگە لەوەی ئەفسەر و سیاسیی و پاشان وەزیر و کاربەدەستی میریی بوە، هاوکات نوسەر و زمانناسێکی دیاری کوردەو کارەکانی لەو روەوە جێگەی بایەخە.

بەڵام ئەوەی کە کەمتر ناویی هەیە، هاوسەری تۆفیق وەهبییە، کە هەر نازناوی ئەوی وەرگرتوە و بە ناوی (ئاسیا تۆفیق وەهبی) ناسراوە.

ئەم خانمە لەساڵی ١٩٠١ لە بەغدا لەدایکبوە، کوردە و باوکی کە ناوی رەزایە، بە ئەسڵ خەڵکی سلێمانییەو بازرگان بوەو بەوهۆیەوە روی لە پایتەخت کردوەو لەوێ نیشتەجێ بوە. ئەمەش وایکردوە کە کچەکەی خوێندەوار و رۆشنبیر بکات و هاوکاریی بکات بۆ ئەوەی پەرە بەتوانای خۆی بدات.

لەساڵی ١٩٢٧ دا، ئاسیا لەگەڵ تۆفیق وەهبی بەگ دا هاوسەرگیریی دەکات، ئەم هەنگاوەش دەرگای زۆر بواری لێدەکاتەوە، بەتایبەتی کە هاوسەرەکەی رۆشنبیر و کەسایەتییەکی رۆشنبیریی و سیاسیی دیاری عێراق بوە.

زۆرترین ئەو بوارەی (ئاسیا) جەختی لێکردوەتەوە، پرسەکانی ژنان و یەکسانی بوە. ئەو هەر زو لەگەڵ ژمارەیەک لە ژنانی تری رۆشنبیر و چالاکوان، هەوڵی دروستکردنی گروپ و پاشان کۆمەڵە و دواتر یەکێتیی تایبەت بە ژنانیان داوە.

دیارترین وێستگەی ژیانی ئەم ژنە، بۆ ساڵی ١٩٤٥ دەگەڕێتەوە، کاتێک توانی لەگەڵ هاوکارانی دا یەکێتی ژنانی عێراق دروست بکات و خۆیشی ببێتە سەرۆکی، ئەم یەکێتیەش گرنگیەکەی لەوەدا بوە کە توانا و گروپ و رێکخراوەکانی ژنانی لەژێر یەک چەتر دا کۆکردوەتەوە و لەرێگەی چالاکیەکانییەوە، هانی داوە یاساکانی وڵات بەشێوەیەک ئاراستە بکەن کە یەکسانی رەگەزیی تیادا بەرقەرار بێت.

ئاسیا، لەو ژنانەیە کە لە بنەڕەتەوە باوەڕی بە یەکسانی ژن و پیاو هەبوە، لەوبارەوە لە وتارێکدا لەساڵی ١٩٥٠ دا نوسیویەتی: «ئێمە باوەڕمان وایە کە ئەرکی ژنان ئەوەیە شان بەشانی پیاوان بن و بەشداریی لە خۆشی و ناخۆشیەکانیان دا بکەم، بۆیە بەدەستهێنانی تەواوی مافەکانی ژنان بەبێ هیچ کەموکورتیەک، کردوە بە ئامانجی سەرەکییمان، بۆ ئەوەی ژنانیش بتوانن مافە سیاسیەکانی خۆیان پیادە بکەن».

ئەم خانمە لەرێگەی یەکێتیی ژنانەوە، بە زۆر کار هەستاون، لەوانەش رۆڵیان هەبوە لە برەودان بەخوێندنی کچان و کردنەوەی خولی نەخوێندەواریی و بەرەنگاربونەوەی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان و بەتایبەتی لەشفرۆشیی و هەروەها مامەڵەکردن لەگەڵ کەیسەکانی جیابونەوە. ئەو هەر زو رایگەیاندوە کەپێویستە لەکاتی جیابونەوەدا منالان بە پێی شیاویی دایک و باوکەکە بەیەکێکیان بدرێت نەک راستەوخۆ بە یەکێکیان بدرێت بە بێ بەدواداچون.

کارەکانی ئەم ژنە بەردەوام بوە و توانیویەتی بەشداریی لە چەندین کۆنگرە و کۆبونەوەی رێکخراوەکانی ژنانی عەرەبی و جیهانی دا بکات، لەنمونەی ئەنجامدانی کۆبونەوەی یەکێتیەکانی ژنان لە بەغدا لەساڵی ١٩٥٢ و نوێنەرایەتییکردنی ژنانی عێراق لە کۆنگرەی ژنانی جیهان لە پاکستان لە ١٩٥٢ و کۆنگرەکانی دواتری ژنانی وڵاتانی عەرەبی لە بەیروت و دیمەشق.

سەرباری کاری چاکوانی، ئەم خانمە بەردەوام بوە لە کاری رۆشنبییریی و نوسین، بەشێوەیەک کە چەندین وتار و لێکۆڵینەوەی لە گۆڤاری یەکێتی ژنان و گۆڤارەکانی تریش بڵاو کردوەتەوە، نوسینەکانیشی بە ئاراستەی پەرەپێدانی بەشداریی ژنان لە کاروباری کۆمەڵ و بەرزرکردنەوەی توانا و هۆشیاریان و بەدەستهێنانی مافی سیاسیی ژنان بوە.

ئەم خانمە پاش «شۆڕشی» تەموزی ١٩٥٨، لەگەڵ هاوسەرەکەی کۆچیان کردوە بۆ لەندەن و لەوێ ماوەتەوە تاوەکو لەساڵی ١٩٨٠ دا کۆچی دوایی کرد. لەسەر وەسیەتی خۆی هێنراوەتەوە بۆ بەغدا و تەرمەکەی لە مەزاری شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە بەغدا، بەخاک سپێردراوە.

# «با هۆڵەکانی وەرزش تەنها بە ڕۆژ بۆ ژنان نەبن»



■ نەوژین، نازەنین گۆران

**لەگەڵ زیادبونی روکردنی ژنان بۆ هۆڵەکانی ڕاهێنانی وەرزشیی و لەشڕێکیی، داوا دەکەن کە ناچار نەکرێن بەتەنیا لە ڕۆژ دا ڕاهێنان بکەن، بەڵکو هاوشێوەی پیاوان لە شەوانیش دا هۆڵەکان بۆ ئەوانیش کراوە بێت.**

ماوەیەکە لە کەلار هۆڵە داخراوەکانی وەرزشیی بۆ ژنان رویان لە زیادبون کردوە، بەشێوەیەک کەم گەڕەکی قەزاکەو تەنانەت هەندێک لەناحیەکانیشی هەیە، هۆڵێکی وەرزشی یان زیاتری نەبێت بۆ ژنان، بەڵام بە زۆری ئەو هۆڵانە لە ڕۆژ و بەتایبەتی تریش لە کاتی بەیانیان هەتا نیوەڕوان بۆ ژنان فەراهەمن و کاتەکانی تر بە بەتایبەت شەوان، بۆ رەگەزی نێرن.

هەندێک لە ژنان، بە گونجاوی دەزانن کە ئەوانیش لە شەودا دەرفەتی وەرزشکردنیان پێبدرێت، بەتایبەت بەهۆی کەشوهەوا و گەرماوە.

واژین محەمەد، ١٨ ساڵ، خوێندکاری زانکۆیە، باس لە حەزی خۆی بۆ یاری لەشجوانی دەکات و دەڵێت: «بەهۆی گەرما و کاروباری تایبەتی خۆمەوە، بۆم ناکرێت بە ڕۆژ سەردانی هۆڵی وەرزشی بکەم، چەند جارێکیش بە بەرپرسانی هۆڵەکانم وتوە کە بەشەوان بۆ ژنان فەراهەم بێت، بەڵام ئەوان رەدی دەکەنەوە، ئەمەش وای لێکردوم کە شەوان لەماڵەوە یاری بکەم».

ژنان باس لەوە دەکەن کە بەشداری نەکردنیان لەهۆڵی لەشجوانی لەشەواندا، زیاتر هۆکاریی کۆمەڵایەتیی و رۆشنبیریی هەیە و پەیوەندیشی بە ڕێگەدانی خێزانەکانەوە هەیە، ئەم رایەش ڕاهێنەری هۆڵێکی وەرزشیی ژنان جەختی لێدەکاتەوە.

سومەیە ئەحمەد، باس لەوە دەکات کە پێشتر هۆڵەکەی بە ڕۆژ بۆ خانمان و شەوان بۆ پیاوان بوە، بەڵام ئێستا بە ڕۆژ تایبەتە بەخانمان و بەشەوان کارناکات.

دەڵێت: «بیرم نەکردوەتەوە کەبەشەوان هۆڵەکەم بکەمەوە بۆ ژنان، چونکە بەشدارمان کەمن و تاوەکو ئێستا تەنها یەک ژن داوای لێکردوم بۆ ئەو مەبەستە و ناشکرێت هۆڵێک تەنیا بۆ یەک ژن بکرێتەوە».

بەڵام کچێک ئەم رایە رەد دەکاتەوەو نمونەی خۆی دێنێتەوە کە بۆی گونجاوترە بە شەوان ڕاهێنان بکات و خێزانەکەشی ئاستەنگ نابن بۆی.

سایە ئیبراهیم، ١٨ ساڵ، وتی: «من ئەگەر بمەوێت شەوانە بەشداری بکەم، هیچ ئاستەنگێکم نایەتە پێشەوە، چونکە بەلای خێزانەکەمەوە شتێکی ئاساییە، هەر بۆیە پێمباشە دەرفەتی وەرزشکردن بە شەوان بە ژنانیش بدرێت».

وادیارە زۆربونی داواکاریی ژنان بۆ وەرزشکردن لە شەو دا، وایکردوە کە هەندێک لە هۆڵەکان دەرگاکانیان بە شەوانیش بۆ ژنان بخەنە سەر پشت.

سومەیە عەبدولستار، ڕاهێنەری هۆڵێکی وەرزشیی داخراوە لەکەلار، ئاماژە بەوەدەکات کە هۆڵەکەیان پێشتر بە شەوان تایبەت بوە بە پیاوان، بەڵام ئێستا ئەو بەرنامەیەیان گۆڕیوە.

دەڵێت: «هۆڵەکەم پێشتر شەوان تایبەت بو بە پیاوان، بەڵام ئێستا بەیەکجاری کردومە بە هی خانمان بە ڕۆژ و بە شەویش».

سەبارەت بەم بڕیارەش، دەڵێت: «پێشتر بڕیارم دا کە بە شەوان تایبەت بێت بەپیاوان، بەڵام بەهۆی ئەوەی خانمان زۆر داوایان لێکردم کە بەشەوانیش بیکەمەوە و بتوانن بەشداربن، بۆیە بڕیارم دا کە بەشەوانیش بیکەمەوە و سودێک بەخانمانی شارەکەم ببەخشم».

بەڵام بەپێچەوانەوە، هەندێکی تر لە ژنان بەگونجاوی دەزانن کە شەوان تەرخان بکەن بۆ پشو نەک یارییکردن.

روخۆش سدیق، ٣٤ ساڵ، باس لەوە دەکات کە شەوان تایبەتە بە کۆبونەوەی خێزان نەک یاری کردن، دەڵێت: «من بەبێ هیچ ڕێگریەک حەزم لێنییە بەشەوان رو لەهۆڵی لەشجوانی بکەم، چونکە پێموایە شەوان تایبەتە بە خێزان و پشو دان».

> بۆم ناکرێت بە ڕۆژ سەردانی هۆڵی وەرزشی بکەم

> بەشەوان بەشداری ژنمان کەمە، بۆیە نایکەینەوە

# چی لەبارەی زیانەکانی ئارایشتەوە دەزانیت؟

■ نەوژین، ئەسما کەریم

**بەرهەمەکانی جوانکاری تایبەت بەپێستی روخسار، بەشێوەیەکی بەربڵاو بەکاردێن لەناو ئافرەتاندا، ئەگەرچی جوانی بەروخسار دەبەخشن، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لایەنی نەرێنییان هەیە بەتایبەت کە هەندێک جۆریان بڕێکی زۆر مادەی کیمیاییان تێدایە.**

ڕەنگە زیادەڕۆیی نەبێت ئەگەر بڵێین ژن و ئارایشت وەکو دو دوانەی لێکدانەبڕاو وەهان، بەشێوەیەک کەم ژن هەیە لە ژیانی ڕۆژانەی پەنا بۆ ئارایشت و جوانکاریی نەبات، ئەم پەنابردنەش زۆر و کەم کەوتوە بە پێی خواست و ئارەزوی خودی ژنان.

ئەوەی لە ئارایشت دا زۆرتر لەلایەن ژنانەوە بیری لێدەکرێتەوە، لایەنە جوانکارییەکەیە، بێ بیرکردنەوە لەوەی کە ئەم مادە و کەرەستانە ڕەنگە زیانی تەندروستییان بۆسەر جەستە و بەتایبەتیش پێست هەبێت.

سازان ئەحمەد، ٢٣ ساڵ، ئاماژە بەوەدەکات کە لەڕێگەی ئارایشت کردنەوە، توشی گرفت لە پێستی دا بوە.

وتی: «لەکاتی ئارایشت کردندا زیپکە و پەڵە لەسەر پێسی روخسارم دروست دەبێت».

ئەو کچە باس لەوە دەکات، کە بەوهۆیەوە خۆی دەبوێرێت لە بەکارهێنانی ئارایشت و ناچاریش بوە سەردانی پزیشک بکات.

بەڵام ئەم حاڵەتەی لە (سازان)دا روی داوە، بەوتەی کچێکی دیکە، ڕەنگە تایبەت بێت و پەیوەندی بەوەوە هەبێت کە پێستی ئەو هەستیارە.

نور ئیسماعیل، ٢٧ ساڵ، ئاماژە بەوەدەکات کە بەوهۆیەی پێستی ئاساییەو هیچ هەستیارییەکی نییە، بۆیە بەشێوەیەکی ڕۆژانە ئارایشت دەکات و هیچ کێشەیەکی نییە.

بۆ (نەوژین) وتی: «لەکاتی دەرچونم بۆ دەرەوە و ڕۆشتنە سەر کارم، ماکیاژ دەکەم و هیچ کێشەیەک بۆ پێستی روخسارم دروست نابێت، چونکە بەگوێرەی پێستەکەم ماکیاژ دەکەم».

دروستبونی کێشە لە پێست، وایکردوە ژنان بیر لە ڕێگە چارەی دیکە بکەنەوە بۆ ئارایشت و جوانکردنی روخساریان بەتایبەتی، یەکێک لەو ڕێگایانەش، بەکارهێنانی ماسکی سروشتییە.

سێوە مەجید، ١٨ ساڵ، دەڵێت: «من بە زۆری لەبری ئارایشت ماسکی سروشتی بۆ روخسارم بەکاردێنم، چونکە هیچ مادەیەکی زیانبەخشی تێدا نیە و پێستی روخسار جوانتر دەکات».

جگە لە هەستیاریی پێستی هەندێک لە ژنان، یەکێکی تر لە هۆکارە سەرەکیەکانی ئەو زیانانەی کە بەهۆی ئارایشتەوە دێنە ئاراوە، پەیوەندییان بە کوالێتی کەرەستەکانەوە هەیە. بۆیە

> دەبێت ئافرەتان دڵنیابن لەماوەی بەسەرچونی ماکیاژەکە



دەکرێت بپرسین: ئایا لەروی کوالێتی و ئەسڵیی جۆری ئارایشتەوە، ئارایشتی کام وڵات باشترینە؟

شەیما مەحمود، کاری بەڕێوەبردنی فرۆشگای جوانکاریی ژنان دەکات لەکەلار، وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەداتەوە.

وتی: «زۆربەی وڵاتان ماکیاژ دروست دەکەن و دەیخەنە بازاڕەوە، بەڵام وڵاتی فەرەنسا لەروی کوالێتی ماکیاژەوە باشترین جۆری ماکیاژ بەرهەم دەهێنێت و لەسەر ئاستی جیهانیش زۆرتر ماکیاژی ئەو وڵاتە بەناوبانگ و بە برەوە».

ئەگەر هەستیاریی و کوالێتی کەرەستەکان ڕۆڵی بەرچاو بگێڕن لە دروستبونی کێشە لە پێست و روخساری ژنان دا، ئەوا هۆکارێکی تریش سەربار دەکرێت، ئەویش ئەوەیە کە چۆن و کەی ئارایشت بەکار بێنین بەتایبەت لەگەڵ وەرز و کەشوهەوادا؟

شەیدا، خاوەنی ئارایشتگایەکی تایبەت بە جوانکاریی ژنانە لە کەلار، ئاماژە بەوەدەکات کە دەبێت بەپێی وەرزەکان، ئارایشتەکان بگۆڕدرێت.

وتی: «لەوەرزی هاویندا دەبێت لەبری ئەساس دژە خۆر بەکاربهێنین، چونکە تیشکی خۆر زیان بەپێستی روخسارمان دەگەیەنێت، نابێت ماکیاژ لە چوار کاتژمێر زیاتر بەپێستی روخسارمانەوە بمێنێتەوە».

پزیشکێکیش باس لەوەدەکات کە گرتنەبەری هەندێک ڕێوشوێنی هەڵە، وادەکات ئارایشت لەبری جوانکاریی، توشی نەخۆشیی و کێشەمان بکات.

د. بنار سەردار، پزیشکی ڕاهێنراوی پێست، بۆ (نەوژین) وتی: «ئەو ماکیاژەی کە خانمان بەکاری دەهێنن دەبێت لەگەڵ جۆری پێستەکەدا گونجاو بێت».

وتیشی: گرنگە لە بەکارهێنانی ئەساسی چەور دوربکەوینەوە، چونکە ئەبێتە هۆی داخستنی کونیلەکانی پێست.

ئامەژەی بەوەشدا: «پێش هەرشتێک ئافرەتان دەبێت دڵنیابن لەماوەی بەسەرچونی ماکیاژەکە».




# ژن لە نێو فەرهەنگ و زمان دا



■ سارا مەجید

**مامۆستا قوتابی فێر دەکات. پزیشک نەخۆش چارە دەکات. نژیار دیوار دروست دەکات. دارتاش کورسی دروست دەکات. نانەوا نان دەبرژێنێت. جوتیار زەوی دەکێڵێت. ئاسنگەر پەنجەرە دروست دەکات. گۆشتفرۆش گۆشتدەفرۆشێت.**
**ئەو رستانەی سەرەوە، یەکێکن لە وانەکانی کتێبی کوردی پۆلی دوی بنەڕەتی لاپەڕە ١٦، بە ناوی (ئەم مرۆڤانە کار دەکەن).**

ئەوەی جێگەی تێبینییە لەم رستانەدا، بکەری ژن بەشداری پێنەکراوە. واتە پیشەکانی وەکو گۆشتفرۆش، ئاسنگەر، دارتاش، نژیار، جوتیار، پیاو بکەری ئەوانەیە لە کۆمەڵگادا. جگەلەوەی بۆ کۆی پیشەکان، تەنانەت (مامۆستا، پزیشک)یش، هەر وێنەی پیاو دانراوە لەتەکیاندا!
کاتێک من ئەم بابەتە بە خوێندکارە تەمەن ٧ ساڵەکانم دەڵێمەوە، لە زیهنی ئەواندا، ژن دادەماڵم لە هەمو ئەرکێک. پێی دەڵێم ئەو بکەر نییە لە ژیاندا و زیادەیە.
کتێبەکە بۆ وێنەی نانەوا پیاوی داناوە، لە کاتێکدا ئەوە خێزانەکانن بە درێژایی مێژو، دو ژن و سێ ژن نانی تێدا کردون و دەکات.
مادام ناونیشانی بابەتەکەش ئەمەیە: (ئەم مرۆڤانە کار دەکەن). کەواتە راستەوخۆ بە خوێندکارێکی دوی بنەڕەتی دەڵێیت ژن هیچ کارێک ناکات. ئەوە تەنیا پیاوە کە مرۆڤە.
منداڵێکی بچکۆلە پێویستی خۆی، لە رێگەی پرۆگرامەوە، ئەم ئایدیایە دەخزێنرێتە مێشکی، کە ژن خاوەنی هیچ وەزیفەیەک نییە و زیادەیە. هەر بۆیە منداڵ ناتوانێت بیر لەوە بکاتەوە، دایکی تا بەیانی ناخەوێت و لایلایەی بۆ دەکات، تێبگات ئەوە قورسترین وەزیفەیە!
منداڵەکە نازانێت، چونکە لە کتیبەکەدا نەنوسراوە، دەکرا لە کتێبەکەدا بنوسن: دایک بێشکە رادەژەنێت. دایک منداڵ دەخەوێنێت. خوشک فلان و فیسار کار دەکات. یان پیشەیەکیان بهێنایەتەوە وەک نمونە، دەلالەت لە ئەرکی ژن بکا.
ئەمە جگە لەوەی، زۆرینەی رستەی وانەکانی تری کتێبەکە، هەر ئازادە دەچێت بۆ بازاڕ و هەر نەوزادە لە قوتابخانە دەگەڕێتەوە، هەر شێرکۆیە پیاوێکی نابینا لە شەقام دەپەڕێنێتەوە!
لێرەدا ئیتر منداڵەکە ناتوانێت درک بەوە بکات، جل شۆشتن و رۆژی سێ ژەم تێکدانی قاپ و پیسکردنی و دوبارە شۆردنی و جارێکیتر خستنەوە شوێن خۆی، ئەرکێکە بەسەر شانی خوشک و دایکییەوە.
منداڵەکە فێرنابێت، هەمو رۆژێک تێکدانی نوێنەکان و دوبارە قەدکرنەوەی، سێ ژەمە خواردن دروستکردن و ماڵ خاوێن کردنەوە و کۆکردنەوەی، خۆپیسکردنی منداڵ و شۆردنی فەرش و درونەوەی پەردەی دڕاو و لێخستنی دوگمەی کەوتوی قەمیسەکانی ماڵ و پینەوپەڕۆکردن و ئەو هەزار ئیشە وردەیەی ماڵ کە نابنە نوسین و مەگەر ژن بیت ئینجا درکی دەکەیت، ئەمانە قورسترین ئیشن، چونکە وردترین ئیشن و و لقیان زۆر لێدەبێتەوە.
لەکاتێکدا پیاو مێشکی لای یەک ئیشە. یان شۆفێرە، یان دوکاندار (ئەمە بچوککردنەوەی ئیشی پیاو و بێ نرخکردنی ئەو قورساییەی خێزان نییە کە لەسەر شانییەتی)، بەڵام قسەکردنە لەسەر ئەو هەمو لێپرسراوێتیی و وردە ئیشەی کە ژن دەبێت لەیەک کاتدا بیری لای هەمویان بێت و ئەمە زیرەکی و سەبری دەوێت.
ئەو ئایدییانە لەڕێگەی پرۆگرامەوە دەخزێنرێتە مێشکی منداڵەوە، بۆیە کاتێک ٢٥ ساڵی تر منداڵەکە دەبێە پیاوی ژنێک، ژنەکەی دوای ئەوەی لە شەشی بەیانییەوە بەردەوام بە پێوە بوە و ئیشی کردوە تا ١٢ی شەو، دڵی لەوە دەشکێ و دەڵێت: مێردەکەم دەڵێت جا ئێوە ئیشتان چییە.
ناوبڕ: کاتێک فێمینزمێک، یان ژنێکی نێو رێکخراو، ئەم رستەیە لە پیاو دەبیستێت، پێی دەڵێت: بێ وەفا، یان جنێوبارانی دەکات. تێناگات کێشەکەیە پەروەردە و بنەڕەتەکەیە.
مەبەست: زۆرینەی زۆری ئەوانەی لە بواری کەیسی ژناندا کار دەکەن (بە ئیسلامی و عەلمانییەوە)، جگە لە ژاوەژاوکردن، نەیانتوانیوە دۆزی ژن بگۆڕن بەرەو باشتر، چونکە مەعریفەیان نییە. کاتێک ژنێک دەکوژرێت، لەبری ئەوەی جوێن بە پیاو بدەن، بێن ئیش لەسەر بنەڕەتەکە بکەن کە (پەروەردە) یە و کۆی سیستەمەکەی تێکداوە.
هەندێکجار کارێک بۆ ژنێک دەکەم، بایی ١٠ کاتژمێر هیلاک دەبم پێیەوە. لە کۆتاییدا لە بری ئەوەی دوعا بۆ خۆم بکات، پێم دەڵێت: «یاخوا برات نەمرێت». ئەمە ئایدیایە لە مێشکی ژنەکەشدا چەسپێنراوە کە پیاو پیرۆزترە و لەبری هیلاکییەکانی تۆش، هەر دەبێت ئەو پاداشت بکرێت.
بۆیە ژنکوشتن بە دو دروشم و چەنەبازی سەر شەقام و جوێندان بە پیاو چارە نابێت، بە خوێندنەوە سەقەتەکانی فەیسبوک چارەسەر نابێت لەکاتی کوژرانی ژنێکدا، بەڵکو بە کوشتنی ئەم ئایدییایانە چارە دەبێت لە بیر و زماندا، کە پێشتر باسم کرد.
لە دەوام دێمەوە، مەرحەبای چەند ژنی کۆڵان دەکەم، خۆم کچم پێم دەڵێت: «بەخێر بێیتەوە باوکەکەم. تۆ چۆنی براکەم، خوا بێوەیتکات کوڕەکەم»، ئەمە ئایدییایە لە نێو زماندا!
ئەو سێ نمونەی سەرەوە کە هێنامەوە. بکەرەکانی رستەی کتێبەکە و دوئایدیاکە لە نێو زماندا، پێمان دەڵێن: ژن کوشتن و کێشەی ژن و بە بچوک سەیرکردنی، هێندەی پەیوەندی بە (زمان، فەرهەنگ، کەلتور، پەروەردە و سیستەم)ەوە هەیە، هێندە پەیوەندی بە خراپی پیاوەوە نییە. هێندەی دەبێت بە توێژینەوەی دەروونناسی و کۆمەڵناسی ئیشی لەسەر بکرێت، هێندە پێویستی بە چەقەچەقی سەرشەقام و بەردەم مایکرۆفۆن نییە.
کێشەی ژنانی نێو رێکخراو و ژنانی فێمێنیست ئەمەیە: هەمیشە چاوەڕێی ئەوەن ژنێک بکوژرێت، برژێنە سەرشەقام و هەرا بنێنەوە، نەفامییە چاوەڕێی روداو بکەیت بقەومێ، لەکاتێکدا دەبێت پێش روداو بکەویت. لەکاتێکدا کێشە سەرەکییەکە ئەوەیە، تۆ ژن لە نێو فەرهەنگ و زاراوەتدا کوژراوە، تۆ ژن لە نێو زمانی نەتەوەکەتدا بچوک کراوەتەوە. کاتێک ئایدییایەک بنەبڕ دەبێت، هەزار ساڵی تری دەوێت ئەو ئایدییایە لە زمان و فەرهەنگی نەتەوەیەکدا بسڕیتەوە. تۆ دەبێت بێیت ئیش لەسەر فەرهەنگ و زمانی نەتەوەکەت بکەیت. لەبری لافیتە بەرزکردنەوە، دەبێت لەگەڵ وەزارەتی پەروەردەدا دابنیشیت و بۆی رونبکەیتەوە، ئەم جۆرە لە پرۆگرام، سەد ساڵی تر کلتوری ژنکوژی لە کوردستاندا درێژ دەکاتەوە.
یەکێک لە ژنە دیارەکانی نێو رێکخراوێکی ژنان، لە سەردەمی دایناسۆرەکەدا، دەستی کرد بە هەرا لە فەیسبوک: «تێلم بۆ مەلا مەزهەر کردوە، سوکایەتی پێکردوم. بەیانی دەچم بۆ دادگا شکاتی لیدەکەم، کێ دێت لەگەڵم؟ چ کەناڵێکی ڕاگەیاندن دەیەوێت، ئامادەم لێدوانی بۆ بدەم». هەر ئەمەیە ئینسان حەزبکات بە زۆر خۆی بکات بە مەوزوع! وادەزانن ئیتر بەم ژاوەژاوانە کێشەی ژنتان تەواو کردوە!
دواتر ئەم فەرهەنگ و زمان و سیستەمە، هێندەی تێروانینی پیاو تژی کردوە لە بچوک سەیرکردنی ژن، دو هێندە ژنی گێل و بێ مەعریفە کردوە.
کەواتە دەگەینە ئەو ئەنجامەی پێویستە بۆ گەڕانەوەی شکۆ بۆ ژن و نەهێشتنی توندوتیژی، واز لە لۆمەکردنی پیاو بهێنرێت، کە پیاو خۆشی قوربانی سیستەمەکەیە. ئەوەی ژنێکی فێمینست و نێو رێکخراوەکانی ژنان گەرەکە بیکەن، ئەم سێ خاڵەیە:
یەکەم: ئیشکردن لەسەر (فەرهەنگ، زمان، پەروەردە، کەلتور و سیستەم).
دوەم: ئیشکردن لەسەر ژن و هۆشیارکردنەوەی و ئاشناکردنەوە بە ئەرک و مافی خۆی و پێدانی مەعریفەی دور لە توندوتیژی و دور لە دژایەتی پیاو پێی.
سێیەم: خۆپەروەردەکردن. هەمو ئەو ژنانەی لە دوای ساڵی (١٩٩١)ەوە ئیش بۆ ژن دەکەن، گەر هەریەکەیان ئیشی لەسەر خۆپەروەردەکردن بکردایە، گەر کچەکەی و کوڕەکەی خۆی بەشێوەیەکی هاوسەنگ پەروەردەبکردایە کە کەسیان مافی ئەوی تریان نەخوا، ئێستا سەبارەت بە ژن، فەرهەنگ و کلتور و زمانمان شتێکی مرۆڤانە تر بو.

# هاوسەرگیری پێشوەختە چییە؟

خراپی دۆخی ئاسایش و ئاوارەیی، پاڵنەرە بۆ بەشودانی منداڵی کچ



ژینۆ خەلیل*

**هاوسەرگیری پێشوەختە یەکێکە لەجۆرەکانی هاوسەرگیری، کە دور لە بنەماکانی مافی مرۆڤ و دور لە هەندێک بنەمای یاسایی ئەنجام دەدرێت، ئەم کارەش جگە لەوەی پێشێلکردنی مافەکانی لایەک یان هەردولای هاوسەرگیرییەکەیە، هاوکات هۆکاریشە بۆسەرهەڵدانی کێشە خێزانییەکان تا دەگات بە هەڵوەشاندنەوەی.**

ئەم پرۆسەیە بەزەقی لەکۆمەڵگەی کوردیدا رەنگی داوەتە و دیاردەی نەخوازراوی لێدەکەوێتەوە، بەداخەوە تاوەکو ئێستا کۆمەڵگە و دابونەریت نەیانتوانیوە دەستبەرداری ئەم کردارە بن، هەرچەندە ئەم پرۆسەیە لەیەکێک لەخاڵەکانی یاسای ژمارە ٨ ی بەرەنگاربونەوەی خێزانیدا هاتوە و بەپێی یاسا قەدەغە کراوە.
توێژەران و چالاکوانی بواری ژنان و منداڵان و یاساناسان و مافپارێزان، لە بەدواداچونکردن و لێکدانەوەی هۆکارەکانی ئەم حاڵەتەدا، کۆمەڵێک هۆکار بۆ سەرهەڵدان یان هەڵکشانی رێژەی ئەم پرۆسەیە دەستنیشان دەکەن، بریتین لە:
١. کەمی هۆشیاری کۆمەڵگە دەربارەی زیانەکانی هاوسەرگیری پێشوەختە، بەتایبەت ئەو کچانەی هاوسەرگیری پێشوەختە دەکەن هۆشیاری و رۆشنبیرییان نییە دەربارەی پرۆسەکە، هەربۆیە بەبێ بیرکردنەوە پرۆسەکە ئەنجام دەدەن، ناتوانن کارەکانیان رێکبخەن و ئەرک و مافی خۆیان نازانن.
٢. نەبونی داهاتێکی سەربەخۆ، لەکۆمەڵگەی ئێمەدا زۆربەی کچان بێکارن و خاوەنی داهاتی سەربەخۆی خۆیان نین، هەربۆیە دەبێت چاوەڕێی دەستی باوک و برایان بن تامەسرەفیان بکێشێت.
لەکاتێکدا خێزانەکان نەتوانن پێداویستییەکانیان دابین بکەن، پەنا دەبەنە بەر هاوسەرگیری بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکان ئەگەرچی نەگەشتونەتە قۆناغی کامڵبون.
٣. جێبەجێنەکردنی یاسا وەکخۆی هۆکارە بۆ زیادبونی هاوسەرگیری پێشوەختە، هەرچەندە ئامانجی یاسا دیاریکردنی ئەرک و مافی هاوڵاتیانە و سەپاندنی سزایە بۆکەسی سەرپێچیکار، بەڵام چاوپۆشی و لاوازی لەجێبەجێکردنی سزاکاندا هەیە.
هەروەها تاکەکانی کۆمەڵگە هۆشیارییان کەمە یان بێئاگان لەدەرچونی یاساکان، هەربۆیە لەدەرەوەی دادگا یان لەناوچە جێناکۆکەکان هاوسەرگیری پێشوەختە ئەنجام دەدرێت.
٤. هەبونی توندوتیژییەکان لەناو خێزاندا بەتایبەت بەرامبەر بەکچان، هۆکارە بۆئەوەی کچان لەتەمەنێکی منداڵی دا پەنا ببەنە بەر هاوسەرگیری بۆ ئەوەی لەخێزانەکانیان و لەو بارە باوکسالارییە رابکەن.
زۆربەی کچان ئەمە بە رێگە چارە دادەنێن بۆ بەدەستهێنانی ئازادی و خۆشبەختی، ئەگەرچی بەهۆی تێنەگەیشتنیان لەپرۆسەکە ئاستەنگێکی زۆر دێتە رێگەیان.
٥. لەکۆمەڵگەی ئێمەدا بە زۆری پیاوان ئارەزوی ئەوە دەکەن هاوسەرگیری لەگەڵ کچانی کەم تەمەن دا بکەن، بۆیە کچان ترسیان لەهەڵکشانی تەمەنیان هەیە، پێیانوایە کە تەمەنیان هەڵکشا ناتوانن هاوسەرێکی گونجاو هەڵبژێن، هەربۆیە هاوسەرگیری پێشوەختە دەکەن، چونکە هاوسەرگیری پێشوەختە لای کوڕان کەمترە، بۆیە زۆرجار کچان شو بە پیاوێک دەکەن، جیاوازییەکی زۆری تەمەنیان هەیە، بەدڵنیاییەوە جیاوازی لەبیرکردنەوەشیاندا هەیە.
٦. خراپی دۆخی ئاسایشی وڵات و ژیان لەئاوارەیدا، پاڵنەرە بۆ ئەوەی خێزانەکان هەر بە منداڵی کچەکانیان بدەن بە شو، چونکە لەو بارودۆخەدا توانای بەخێوکردنی منداڵەکانیان نییە.
٧. ئاین و کەلتور و دابونەریت. لێکدانەوەی شیاویی تەمەنی هاوسەرگیریی کچان لەروی ئاینەوە زۆرو زەوەندە، بەگشتیش ئەو رایە زاڵە کە کچان لەدوای باڵغ بون و پێگەیشتنی جەستەیی و دەستپێکردنی سوڕی مانگانەوە، دەتوانرێت بەشو بدرێن، ئەمەش وەکو بیانو و هۆکارێک بینراوە بۆ پەنا بردنە بەر بەشودانی کچان لەتەمەنێکی منداڵیدا.
ئەو هۆکارانەی کە خستمانەڕو، خۆیان لەناوکرۆکی خۆیاندا، چارەسەریشیان هەڵگرتوە، بەو مانایایەی ئەگەر دەسەڵات و لایەنە پەیوەندیدارەکان کار بکەن بۆ وشککردنی ئەو سەرچاوانەی کە دەبنە هۆکاری ئەم حاڵەتە، ئەوا هاوسەرگیریی پێشوەختە و بەشودانی کچان لەتەمەنێکی منداڵ دا، تاڕادەیەکی زۆر کەم دەکات.
دەبێت ئەم کێشەیە بەتەنیا وەکو پرسێکی ئێستایی سەیر نەکرێت، چونکە لێکەوتەی بۆ داهاتوش هەیە و مەترسیی تێکدانی شیرازەی کۆمەڵایەتیی لێدەکرێت، بۆیە دەبێت هەنگاوی جدی بنرێت بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشە باوەی کۆمەڵگە، ئەویش بەهەماهەنگی حکومەت و رێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی، دەزگاکانی راگەیاندنەکان خەڵک هۆشیار بکەنەوە لەزیانەکانی هاوسەرگیری پێشوەختە.
هەروەها پێویستە حکومەت هەلی کار بۆ کچان برەخسێنێت و ئەوانیش ببنە خاوەنی داهاتی سەربەخۆی خۆیان، بۆئەوەی لەهەرکاتێکدا خێزانەکانیان نەیانتوانی مەسرەفیان بکێشن، پەنا نەبەنە بەر هاوسەرگیری پێشوەختە.
ئەمە سەرباری ئەوەی پێویستە راوێژکاری کۆمەڵایەتی هەبێت بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت بچنە پرۆسەی هاوسەرگیرییەوە و پێشتر گفتوگۆیان لەگەڵ بکرێت و دڵنیا ببن لە شیاوییان بۆ ئەو پرۆسەیە.

* ئەندامی تیمی رێکخراوی وادی ئەڵمانی لەگەرمیان

# بەرگریی کردنی منالّبون (منع).. لە حەپ و دەرزییەوە بۆ چاندنی ژێر پێست



■ نەوژین، دیمەن ئیسماعیل

**ئەگەرچی پێشتر ژنان لە رێگەی خواردنی (حەب، دانانی لەولەب و دەرزی لێدان) هەوڵی رێگریکردنیان دەکرد لەمناڵ بون، بەڵام ئێستا جۆریکی جیاوازی رێگریکردن لەمناڵبون هاتوەتە ئاراوە کە بریتیە لە دەزگای ژێرپێست (inplants)، ژنانیش لەبارەی ئەم رێگایەوە تێبینیی خۆیان هەیە.**

دەزگای ژێرپێست، بریتیە لە دەزگایەکی باریکی پلاستیکی کە لەژێر پێست دادەنرێت و بەرگری دەکات لەسکپڕی، لەدو جۆر پێکدێت، جۆری یەکەمیان کە ناوە زانستیەکەی (Norplant)ە، پێکدێت لە شەش لا بۆ شەش مانگ بەرگری دەکات لەمناڵ بون، ئەم جۆرەیان زۆر بەکارناهێنرێت. جۆری دوەمیان چێنراوی مەنع (implanion)ە، بەچاندنی مادەیەکە بە قەبارەی دەنکە شقارتەیەک کە شەش میلیگرامە و مادەی پرۆجیسترۆن لە پێکهاتەی هەیە، لە ژێرپێستی باڵ دادەنرێت بۆ ماوەی ٣ ساڵ رێگری لە مناڵبون دەکات.

ژنان لەبارەی هەردو جۆرەکەوە، تێبینیی و سەرنجیان هەیە و واباس دەکەن کە پێی رانایەن.

سارا حسێن، ٢٧ ساڵ، یەکێکە لەو ئافرەتانەی کە چێنراوی مەنعی بەکارهێناوە، بۆ (نەوژین) وتی: «ماوەی پێنج مانگ لەدەستم بو بەردەوام نەزیف بوم».

وتیشی: «سەرەڕای نەزیف بون، زۆر تورەی دەکردم، بەڕادەیەک ئارامم نەما، بۆیە ئەم مەنعەم هەڵوەشاندەوە».

چۆنیەتی دانانی ئەم دەزگایە بەشێوەیەکە کە لەبەشی ناوەوەی باسک دادەنرێ ٤ پەنجە سەرو ئانیشک، پێویستی تەنها بە سڕکردنی ئەو ناوچە هەیە بە دەرزی، دەزگاکە دەخرێتە ژێر پێست و بەتەواوی دیار نامێنێت، بەڵام بەدەست لێدان هەستی پێدەکرێ.

> ئەم دەزگایە باشە بۆ ئەو کەسانەی چوار نەشتەرگەریان کردوە

سایە قادر، ٢٥ ساڵ، یەکێکی ترە لەو ئافرەتانەی بۆ ماوەی ٥ مانگ ئەم دەزگایەی داناوە، بۆ (نەوژین) وتی: «بڕیار بو ٣ ساڵ ئەم دەزگایە لەدەستم بێت، بەڵام بەرگەم نەگرت و لامدا».

وتیشی: «وەکو شێتی لێکردبوم، سەرەڕای کاریگەریی تورەبونی بەردەوام، گەرمیەک ئەهاتە ناو مێشکم خەریک بو خوێن لەچاو و لوتم بێتە خوار، لەئازاری گیانم ئەمڕشت بە مناڵەکانم».

میکانیزمی کارکردنی ئەم دەزگایە بریتیە لەدەردانی هۆرمۆنی پرۆجیسترۆن کە بەرگری دەکات لە تەقینی هێلکە لە هێلکەدان لەگەڵ خەستکردنەوەی دەردراوی ملی منداڵدان و تەنککردنەوەی ناوپۆشی منداڵدان کە وادەکات تۆوی پیاو نەگاتە هێلکەدان، بەرگری دەکات لەپرۆسەی دروست کردنی کۆرپەلە.

ئەگەرچی (سایە) بەهۆی تورەبونی زۆرەوە دەزگاکەی لابردوە، بەڵام (سنور) بەهۆی ناوسک و پشت ئێشەوە ئەو کارەی کردوە.

سنور مەحمود، ٣١ ساڵ، چێنراوی مەنعی بۆماوەی ٤ مانگ بەکارهێناوە، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «ناوسکم بەبەردەوامی دەئێشا، سوڕی مانگانەم بۆ نەدەهات».

وتیشی: «سەرەڕای تێکچونی هۆرمۆنی سکپریم، پشت و فەقەراتمی وێران کردبو».

ئەم بەرگریە بۆ کەسانی تەمەن (١٨-٤٥) ساڵ دادەنرێت، بە رێژەی ١٪ ئەگەری دروستبونی مناڵی هەیە، سەرەرای دەرکەوتنی ئەم نیشانانە، رێژەیەکی بەرچاو لە ئافرەتان ئەم رێگا دەگرنەبەر.

پزیشکێکی پسپۆری ژنان و مناڵبون، دەرکەوتنی ئەم نیشانانە بەئاسایی دەزانێت.

د.لانە هیدایەت، پزیشکی پسپۆری ژنان و مناڵبون، بۆ (نەوژین) وتی: «دانانی ئەم دەزگایە دەبێتە هۆی قەڵەوبون و تێکچونی میزاج و سوڕی مانگانە».

بەڵام ئایا ئەم چارەسەرە بۆ کێ بەسودە؟

لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا، (د.لانە هیدایەت) وتی: «دانانی ئەم دەزگایە باشە بۆ ئەو کەسانەی چوار نەشتەرگەریان کردوە و زەخت و شەکرەیان هەیە».

---

# هەمو شتێک لەبارەی (شێرپەنجەی مەمک)ەوە

■ نەوژین، ئامینە محەمەد

**شێرپەنجەی مەمک، یەکێکە لە بەربڵاوترین جۆرەکانی شێرپەنجە، نەخۆشیەکە بە پلەی دوەم دێت لە نێوان نەخۆشییە بڵاوە خراپەکاندا لەدوای شێرپەنجەی سیەکان، لەگەڵ ئەوەی زۆربەی توشبوانی حاڵەتەکانی ئەم نەخۆشییە لە رەگەزی مێن، بەڵام پیاوانیش توشی دەبن.**

ئەم شێرپەنجەیە سەرەکیترین هۆی لەدەست دانی ژیانە لە ژنانی تەمەن ٢٠ بۆ ٥٠ساڵی.

ئەگەر زو پێی بزانرێت بە ئاسایی چارەسەر دەبێت، بەڵام زۆرجار بەهۆی کەمتەرخەمی لەبیر دەچێت و کاتێک پزیشک پێی دەزانێت کە کار لەکار ترازاوە.

لە هەر ٨ ژنێک یەک ژن لەژیانی خۆیدا توشی ئەم شێرپەنجەیە دەبێت، لەبەر ئەمەش لەزۆربەی وڵاتانی جیهاندا هەر لە تەمەنی ٣٠ ساڵ بەرەو سەرەوە پشکنین و چاودێری بۆ دەرخستنی هەر لو و لک و سفتێکی ناو مەمک دەستپێدەکات، تا لەزوترین کاتدا ئەم لکانە بخرێنە ژێر چاودێری و ئەگەر پێویستیان بەچارەسەرکردن و دەرمانی پزیشکی بێت، بۆیان بکرێت.

* نیشانەکانی

هەندێک نیشانە هەن کەدەتوانن یارمەتیدەربن لە زو پێزانینی شێرپەنجەی مەمک، لەوانە:

١. هەبونی تەن یان گرێیەک لە ناو مەمک یان ژێر باڵدا.

٢. هاتنە دەرەوەی خوێن یان هەر شلەیەک جگە لەشیر لە گۆی مەمک .

٣. چونە ناوەوەی گۆی مەمک (هەڵگەڕانەوەی گۆی مەمک بەرەو ناو پێست).

٤. سوربونەوە و ئەستوربون و توێکهەڵدانی پێستی گۆی مەمک یاخود مەمک خۆی.

٥. گۆڕینی شێوەی پێستی مەمک بۆ شێوەی توێکڵی پرتەقاڵ.

٦. دروستبونی برینێک لە مەمکەکەدا دوای ماوەیەک چاک نەبێتەوە.

> ئەم نەخۆشیە بە مانای کۆتایی ژیانی ژنان نایەت

* ئەو هۆکارانەی مەترسی توشبون زۆردەکەن

١. تەمەنی سەرو و بەساڵاچون.

٢. بۆماوەیی، یان توشبونی: خوشک، دایک، باوک و برا.

٣. شوێن و ژینگەی نیشتەجێبون.

٤. ئەو ژنانەی هیچکات دوگیان نەبون.

٥. خواردنی زۆری خۆراکی چەور.

٦. دەستپێکردنی سوڕی مانگانە لە تەمەنێکی کەمدا (پێش١٢ساڵ) هەروەها کۆتای هاتنی سوڕی مانگانە لەتەمەنێکی زۆردا (دوای تەمەنی ٥٥ ساڵ).

٧. ئەنجام نەدانی چالاکی جەستەیی و کێشی زیاد و بەکارهێنانی خواردنەوە کهولیەکان.

٨. هەبونی هەڵە لە جیناتدا وەکو بونی جینی ناکۆکی (BRCA1, BRCA2).

* چارەسەر

چارەسەر بەگوێرەی چەشنی نەخۆشیەکە دەکرێت. هەندێکجار بەنەشتەرگەری و هەندێکجاریش بە دەرمان و چارەسەری کیمیایی و تیشکی و هۆرمۆنی هەوڵی چارەسەری نەخۆشییەکە دەدرێت.

ئەگەر ئەو لوە شێرپەنجەیە تەنها لە یەک شوێندا بێت و بۆ هیچ شوێنێکی دیکە نەچوبێت، ئەوە تەنها ئەو شوێنە دەخرێتە بەر نەشتەرگەری و هەڵدەگیرێت و چارەسەر دەبێت.

بەڵام ئەگەر ئەو لوە پەرەی سەندبێت و چوبێتە شوێنەکانی دیکەی مەمک یان چوبێتە ژێرباڵ و جێی گرتبێت، ئەوا پێویستە مەمک بەگشتی لاببرێت.

هەندێکجاریش لە رێگەی تیشکی بەهێزەوە هەوڵی لەناوبردنی گرێیەکە دەدرێت، ئەگەر پێویستیش بکات ئەوا بە چارەسەری هۆرمۆنی چارەسەر دەکرێت. مەبەست لەم چارەسەرەش ئەوەیە کەکار بۆ ئەوە دەکرێت، ئەو هۆرمۆنەی دەبێتە هۆی پەرەسەندنی لوە شێرپەنجەیەکە نەهێڵدرێت، بۆ نمونە ئەگەر سەرچاوەی هۆرمۆنەکە هێلکەدان بێت ئەوا دەردەهێنرێت.

لەگەڵ هەریەک لەم چارەسەرکردنانەدا ئارەزوی خۆراکی توشبوەکە کەم دەبێتەوە، هەربۆیە خۆراکی باش بەهۆکارێکی گرنگ دادەنرێت و یاریدەدەری جەستە دەبێت بۆ بەرەنگار بونەوەی هەوکردنەکان و بەرگریکارە لاوەکییەکانی چارەسەرە جیاوازەکان، لەوانەیە واپێویست بکات هەندێک راهێنان جێبەجێ بکات لەدوای هەندێک جۆری نەشتەرگەریی بەمەبەستی پارێزگاری کردن لە توانای جوڵاندن و توانای جەستە.

* دوای نەشتەرگەری

زۆرجار دوای نەشتەرگەری لابردنی بەشێکی مەمک یان مەمکێک یاخود هەردو مەمکی ژن، ئەو کەسە هەست بە لەدەستچونی ژنایەتی خۆی بکات، لەبەر ئەوەی کە ئەم هەستە ناخۆشە لە کۆڵی خانمان بکرێتەوە، نەشتەرگەرییەکی جوانکارییان بۆ دەکرێت، کە بەجۆرێکە لە جێی ئەو مەمکە یان هەردو مەمکەکە کە هەڵدەگیرێن، دو دانە مەمکی دەستکرد کە بە ڕواڵەت وەکو مەمکی راستەقینەن، دادەنرێت.

هەروەک ئەم نەخۆشیەش بە مانای کۆتایی ژیانی ژنان نایەت، بەڵکو دوای ئەمەش ژن دەتوانێت درێژە بە ژیانی ئاسایی خۆی بدات.



# چۆن بۆنەکەت هەڵدەبژێریت و کەی لەخۆتی دەدەیت؟

■ نەوژین، سێوە محەمەد

**بۆن و عەتری تۆ، دەبن بە بەشێک لە ناسنامەی تۆ و لە خەڵکی دیکەت جیا دەکاتەوە، ئەگەر دەتەوێت دەوروبەرەکەت بەتۆوە دڵخۆش بن، ئەوا با بۆن و بەرامەت خۆش بێت.**



کچان و ژنان زۆر گرنگی بە بۆن دەدەن، چونکە سەرنجڕاکێش و بەرچاوتر دەریان دەخات، هەربۆیە بۆن بە بەشێکی گرنگی جوانی دادەنرێت، لەلایەن پسپۆڕانی جوانکارییشەوە زیاتر بایەخی پێدەدرێت.

هەروەها بۆن کاریگەری لەسەر دەرونی مرۆڤەکان دروست دەکات، چونکە هەستی بۆنکردن پەیوەندیدارە بە بیری مرۆڤەوە و کاردەکاتە سەر ئارامکردنەوە و وروژاندن و توڕەکردنی مرۆڤ، هەروەک هەڵمژینی بۆنی عەتر بەشێکی مێشک چالاک دەکات.

هەروەها بۆن پەیوەندیدارە بە: ڕێژەی لێدانی دڵ، پەستانی خوێن، هەناسەدان، ڕادەی هیلاکی جەستە و هاوسەنگی هۆرمۆنەکانەوە.

هەستی بۆنکردن پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە لەگەڵ ناوەندی دەستبەسەراگرتنی هەستەوە، کە لەو ناوەندەدا هەستەکانی: (دڵخۆشی، توڕەیی، خەمۆکی، ترس و دڵەڕاوکێ) هەیە.

هەربۆیە دەکرێت بەهۆی عەترەوە مرۆڤ دڵخۆش و ئارام ببێت، یان بەپێچەوانەوە تۆشی دڵەڕاوکێ ببێت.

بۆ ئەوەی خانمان بزانن چ جۆرە عەترێک بەکار دەهێنین یان هەڵیدەبژێرن، دەبێت سەرەتا خۆیان بەدور بگرن لە هەندێک بۆن کە قورسن، ئەم بۆنانە کەسانی دیکەی پێ نارەحەت دەبن.

هەندێک لە کچان بەگوێرەی شوشەی بۆنەکە، بۆن هەڵدەبژێرن، ئەوەش زۆرجار وایان لێدەکات لە هەڵبژاردنی بۆنێک دوای کردنەوەی شوشەی عەترەکە پەشیمان ببنەوە.

گرنگە خانمان بزانن جۆری بۆنەکە چۆنە، بۆنی خۆش تەنها بە بۆنی ناو شوشە نییە، بەڵکو دانانی سابونێکی بۆن خۆش یان بەکارهێنانی عەتررێژێک لەماڵەوە یان لە ژورەکەت، بەشێکی دیکەی زەوق و سەلیقەی دروستی تۆ لەبارەی بۆنەوە پیشان دەدات.

لەوەش گرنگتر ئەوەیە، خانمان بزانن چۆن و کەی بۆن لە خۆیان دەدەن.

بۆ هێشتنەوە و مانەوەی بۆن بۆ ماوەیەکی زۆرتر، شارەزایان ئەم ڕێگە چارانەیان دیاری کردوە:

١. ڕاستەوخۆ دوای خۆشتن عەتر لەخۆت بدە، چونکە لەوکاتەدا کونەکانی سەر پێست کراونەتەوە و دەتوانن بۆنەکە بەخێرایی هەڵبمژن و بۆ ماوەیەکی زیاتر بیهێڵنەوە.

٢. لەکاتی سەرما و وەرزی زستاندا بڕێکی زیاتر عەتر لەخۆت بدە، چونکە سەرما دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی هێزی عەترەکەت، دەشتوانی لەوەرزی زستان دا ئەو عەترانە بەکاربهێنیت کە بۆنەکانیان قورسن.

٣. ئەگەر پێستت وشکە، ڕۆژانە زیاتر لە جارێک عەتر بەخۆتدا بپرژێنە، چونکە پێستی وشک بەپێچەوانەی پێستی چەورەوە، کارلێک لەگەڵ عەتر دا ناکات.

٤. عەتر لەو شوێنانەی جەستە بدە کە جوڵە یان ترپەیان زۆرە، وەکو: دەست، مەچەک، بنهەنگڵ، پشتەگوێ و مل، لەبەر ئەوەی دەمارەکان لەوشوێنانەی جەستە لە پێست نزیکترن و خێراتر بۆنەکە هەڵدەمژن.

٥. لەدوری ١٥ سانتیمەتر لە قژت عەترەکە بپرژێنە، لەبەرئەوەی تاڵە قژەکانت دەتوانن بۆ ماوەیەکی زۆر دەنکۆڵەکانی عەتر بهێڵنەوە، بەڵام پێویستە ئاگاداری ئەوە بیت ئەو عەترانەی کوالێتیان خراپە بۆ ئەم مەبەستە بەکار نەهێنیت، چونکە دەبێتە هۆی تێکدانی قژت.

٦. عەتر بدە لە پشتی ئانیشک «قورناسک»، چونکە دوای گەرمبونی جەستە لەم شوێنەوە دوبارە عەترەکە بۆنی بڵاو دەبێتەوەو زیاتر دەمێنێتەوە.

٧. بەکارهێنانی عەتر لەسەر جل کارێکی باش نییە، چونکە هەمو عەترێک ڕێژەیەک چەوریی تێدایە و دواتر وەک پەڵەیەک بەسەر جلەکە دەمێنێتەوە.

٨. باشترین کاتی بۆن لەخۆدان، بەیانیانی زو یان شەوانە پێش خەوتن.

> دەکرێت بەهۆی عەترەوە مرۆڤ دڵخۆش و ئارام بێت، یان تۆشی دڵەڕاوکێ ببێت

> باشترین کاتی بۆن لەخۆدان، بەیانیانی زو یان شەوانە پێش خەوتن

# لەیلا فەریقی.. ئاوازێکی زیندو و دەنگێکی دلێر

■ نەوژین، شاران بەرزنجی

**ئێمە لەکاتی وتنەوەی گۆرانیە فۆلکلۆریەکان و لە ڕێگەی شاشەی (مەد تی ڤی)یەوە ناسیمان، دواتر کە ورد تر لەسەر خەمەکانی عەشق و ئازادیی و ژنان وەستا، کە داهێنانەکانی روی لە برەو کرد، باشتر و نزیکتر پێی ئاشنا بوین و زیاتر گوێمان بۆ ئەم ژنە دەنگ دلێرە گرت، کە ناوی (لەیلای فەریقی)یە.**



لەنێو ژنانی گۆرانیبێژ و هونەرمەندی کورد، ناوی (لەیلا فەریقی) ون و نادیار نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو وەکو یەکێک لە دیارترین دەنگەکانی ژنان لە گۆڕەپانی میوزیکی کوردیی دا بونی هەیە.

ئەم خاتونە هونەرمەندە، لە دایکبوی شاری مەریوانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە، خوشکی هونەرمەندی ناسراوی کورد (مەرزیە فەریقی)یە. کاتێک کە منداڵ بوە باوکی بەهۆی نەخۆشیی شێرپەنجەوە مردوەو دایکیشی لە بۆردمانێک لە شەڕی ئێران و عێراقدا کوژراوە.

دوای ئەوان برا گەورەکەیان ئاگاداریان دەبێت و دەچن بۆ شاری سنە، لەیلا لە شاری سنە دەچێتە خوێندنگەی سەرەتایی، لە ساڵی ١٩٩١دا دەینێرن بۆ وڵاتی سوید و دەبێتە پەناهەندە لەوێ و تائێستاش لەوێ دەژێت، هەر لەوێش نۆبەرەی کارە هونەرییەکانی بڵاوکردەوە.

سەرەتا هونەرمەند (لەیلا فەریقی) بە وتنەوەی گۆرانیە کۆنەکان بەتایبەتی ئەوانەی مامۆستا (تایەر تۆفیق) دەستی بە گۆرانی وتن کرد، لە سوید یەکەم ئەلبومی گۆرانی خۆی لە ساڵی ١٩٩٧ بەرهەم دێنێت بە ناوی (ئەستێرە).

دواتر لە ساڵی ٢٠٠٠ بە هاوکاری کۆمپانیای Sky Vision Production لە سوید، ئەلبومی (سیاچەمانە) بەرهەم دێنێت.

پاشان لە ساڵی ٢٠٠٢ بەهاوکاری هەمان کۆمپانیا، ئەلبومی (ئەوین و ئازار) بڵاو دەکاتەوە.

دواجاریش لە ساڵی ٢٠٠٧ و لە دوای کۆچی دوایی (مەرزیە فەریقی) خوشکی، (لەیلا) ئەلبومی (گوێم لێگرن) بڵاو دەکاتەوە کە ئەو ئەلبومە بو بە پرفرۆشترین ئەلبومی ساڵ لەو کاتەدا. لەو ئەلبومەدا گۆرانیەکی دوێت «دوقوڵی» لەگەڵ هونەرمەندی بەناوبانگی میسری (عەلی حەجار) دا وتوە بە زمانی کوردی و عەرەبی، ئەم گۆرانییە لە یەک کاتدا بوە هۆی ئەوەی کە لەئاستی کوردستان دا وەکو یەکەم ژن کە دوێتی لەگەڵ گۆرانیبێژێکی عەرەبی کردوە زیاتر ناودار بێت و هەروەها لە وڵاتانی عەرەبیشدا ناسراو بێت، ئەمەش لەکاتێکدایە کە ئامادەگیی ئەم هونەرمەندە لەناو گۆڕەپانی هونەر و میدیای ئێران و فارسی زمانان دا هەیە و میدیاکان بە گرنگییەوە باس لەم هونەرمەندە و بەرهەمەکانی دەکەن.

دوای دابڕان بۆ ماوەیەکی درێژ، ساڵی ٢٠١٧ (لەیلا فەریقی) دوبارە گەڕایەوە بۆ درێژەدان بە کاری هونەری بە وتنی گۆرانی «منیش لێرەم»، هەر لە هەمان ساڵدا ئەلبومێکی تازەی بڵاوکردەوە بە ناونیشانی: «Echoes of the past».

ئەوەی (لەیلا) لەزۆرێک لە ژنانی دیکەی گۆرانیبێژ جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە ئەو پرسەکانی ژنانی لە گۆرانیەکانی دا بایەخ پێداوە، هەروەک لەسەر ئەو ئازار و خەمانەش وەستاوە کە ژنانی کورد بەهۆی ڕەگەزیانەوە ڕوبەڕوی دەبنەوە، ئەمەش لەگۆرانیەکانی (چ دەستێک بو، ئەی براکەم و منیش لێرەم) دا بە زەقیی ڕەنگی داوەتەوە.

> لەیلا، پرسەکانی ژنانی لە گۆرانیەکانی دا بایەخ پێداوە

## دەربارەی نەوژین

نەوژین، ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆی تایبەتمەندە بە پرسەکانی ژنان، مانگانە لەلایەن ڕادیۆی دەنگ لە گەرمیان بڵاودەکرێتەوە.

یەکەم ژمارەی لە ٢٠١٦/١٢/٢٦ دەرچوە.

ڕادیۆی دەنگ، پرۆژەیەکی میدیایی سەربەخۆیە لە ناوچەی گەرمیان، لە (٢٠١٠)وە بە پەخشی ڕادیۆیەکی لۆکاڵی دەستی پێکردوەو پاشان وێبسایتێکی داناوە.

ڕۆژنامەی (نەوژین) یەکێکە لە چالاکیەکانی پرۆژەی ڕادیۆی دەنگ بە پاڵپشتی سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی (NED) ئەمریکی.

ڕۆژنامەنوسانی ئەم ڕۆژنامەیە، ژمارەیەک کچن کەپێشتر خولی ڕاهێنانیان لەلایەن ڕادیۆی دەنگەوە بۆ ئەنجامدراوەو زۆرینەیان پێشتر کاری ڕۆژنامەوانییان نەکردوە.

بۆ پەیوەندیکردن بە ڕۆژنامەکەوە

تەلەفۆن:
٠٧٤٨٠٢٠٧٤٠٠

ئیمەیڵ:
nawzhinnewspaper@gmail.com

فەیسبوک:
nawzhinnewspaper

دەتوانن لەماڵپەڕی ڕادیۆی دەنگ کۆپی ئیلیکترۆنی ژمارەکانی ڕۆژنامەکە ببینن

www.radiodang.org

# کچانی دەربەندیخان تواناکانیان لە تۆپی باڵە دا دەردەخەن



■ نەوژین، ئەحمەد حەمید

**هەرچەندە جگە لە یاری تۆپی پێ یارییەکانی دیکە تەنانەت لەلایەن کوڕانیشەوە گرنگیەکی ئەوتۆی پێنادرێت، بەڵام کچانی دەربەندیخان ئەمەیان پێچەوانە کردوەتەوە و یاری تۆپی باڵەیان لە قەزاکەیان پێشخستوە.**

قەزای دەربەندیخان خاوەنی تیپێکی تۆپی باڵەیە کە بەشدارێکی کارای پاڵەوانێتیەکانە لە کوردستان، ئێستاش لە ڕێگەی فێرگەیەکەوە زیاتر لە (٤٠) فێرخوازی کچ لە سێ ئاستی تەمەن پەرە بە تواناکانیان دەدەن.

بانە کاوە، کچە فێرخوازێکی فێرگەی تۆپی باڵەی دەربەندیخانە و ماوەی سێ مانگە لە فێرگەکە پەرە بە خولیاکانی دەدات. بە (نەوژین)ی وت: «بەردەوامی فێرگەکە بۆ ئێمە گرنگە، چونکە دەتوانین ئاستی خۆمان زیاتر بەرزبکەینەوە».

ئەو لە بارەی دەرفەتەکان بۆ دەرخستنی توانای کچانەوە، دەڵێت: «بە شێوەیەکی گشتی دەرفەت کەمە بۆ کچان، بەڵام فێرگەکەمان و کۆمەڵێک شوێن و چالاکی تر دەرفەتی باشن بۆ کچان و بەردەوامیان دەبێتە هۆی بەرەوپێشچونی باشتر بۆ داهاتو».

بانە، وتیشی: کۆمەڵگا تا ڕادەیەک ڕێگرە، بەڵام پاڵپشتی خێزانەکانمان بۆ ئێمە گرنگە و دەتوانین زۆر کاری باش بکەین.

کچان لە ئێستا جگە لە وەرزش لە بوارەکانی دیکەش پەرە بەتواناکانیان دەدەن و وەکخۆیان دەڵێن: ڕێگرییەکانی کۆمەڵگا پشتگوێ دەخەن و تێیدەپەڕێنن.

ژیلا ئەحمەد، فێرخوازێکی یاری تۆپی باڵەیە لە قەزای دەربەندیخان بە (نەوژین)ی وت: «ماوەی زیاتر لە سێ مانگە لەم فێرگەیە پەرە بە تواناکانم دەدەم، لە سەرەتای دەستپێکردن و بەشداری کردنم لەم فێرگەیە بڕوای تەواوم بە خۆم هەبوە و دڵنیام کە سەرکەوتو دەبم و دەبمە یاریزانێکی باش».

ژیلا، کردنەوەی فێرگەی لەم جۆرە بە گرنگ دەزانێت و باسلەوەدەکات کردنەوەی فێرگەی لەم جۆرە بۆ لاوان دەبێتە هۆی بەرەوپێشچونی شار و کۆمەڵگا.

ئەو، خێزان بەپاڵپشتێکی گرنگ دەزانێت و ئاماژە بەوەشدەکات کە خێزانەکەی پاڵپشتێکی باشی ئەون «بە پشتگیری خێزانەکانمان دەتوانین تا لوتکە بڕۆین و سەرکەوتوبین، ئێمەش مرۆڤین وەک هەر کوڕێک و هیچ جیاوازییەک لە نێوانمان نیە، حەزو خولیا و هێز و توانامان هەیە، بهێڵن و ڕێگرمان مەبن لە پیشاندانی بەهرە و تواناکانمان».

فێرگەی تۆپی باڵەی کچانی دەربەندیخان (٤٠) فێرخوازی هەیە و دابەشی سێ ئاستی کردون و ڕۆژانە لە فێرگەی یانەکە مەشقەکانیان ئەنجامدەدەن.

خەیاڵ حەمە ئەحمەد، ڕاهێنەر لەفێرگەی تۆپی باڵەی کچانی دەربەندیخان، ئەوە دەخاتەرو کە سەرەتا یاریزانێکی زۆر ڕوی لە فێرگەکەیان کردوە و پاش تاقیکردنەوەکان ئەوانەی ماونەتەوە و ڕۆژانە ڕاهێنانیان پێدەکرێت.

ئاماژەی بەوەشکرد: «زۆر خێزان هەیە کە هاوکارن لەبەرامبەر ئەوەی کە کچاکانیان ببنە یاریزان و داهاتوی خۆیان لەو بوارە ببیننەوە، بەڵام خێزانیش هەیە هێشتا نەگەشتۆتە ئەو ئاستە کچەکانیان بهێننە ناو وەرزش».

وەک هەر کوڕێک حەز و خولیا و هێز و توانامان هەیە

«بەرنامەی باشمان هەیە بۆ داهاتو لە روی فروان کردنی فێرگەکە و دابین کردنی کاتی زیاتر بۆ فێرخوازەکان، لە پرۆژەمان هەیە فیستیڤاڵی ساڵانەی وەرزشیمان هەبێت بۆ ئەوەی زیاتر پەیامی وەرزشدۆستیی بگەیەنین بە تاک بە تاکی کۆمەڵگا». خەیاڵ وای وت.

بە هۆی نەبونی پاڵپشتیەکی دارایی باشەوە، بەڕێوبەرانی فێرگەکە ناچار دەبن بۆ بەردەوامبونی فێرگەکە پارە لە فێرخوازەکان وەربگرن.

بەرێز عەلی، لێپرسراوی فێرگەی تۆپی باڵەی دەربەندیخان، دەڵێت: «بۆ هەر مانگێک بری ١٠ هەزار لەهەر یاریزانێک وەردەگرین و بەشێک لە پێداویستیەکانی فێرگەکەی پێ دابیندەکەین، یانەی وەرزشی دەربەندیخان و ناوەندی چالاکی و پێگەیاندنی لاوانی دەربەندیخان، لە دابینکردنی پێداویستیەکانی دیکەی فێرگەکە هاوکارمانن».

جەختیشیکردەوە: «ئێمە بەردەوام دەبین و فێرگەکەش فراوان دەکەین».

---

# کچە فۆتۆگرافەرەکەی کەلار



■ نەوژین، ژینۆ عەلی

**یەکەم کچە کە وەکو فۆتۆگرافەرێکی پیشەیی کار بکات، حەزی لەم بوارە وایکردوە هەوڵبدات نەک هەر خۆی، بەڵکو کچانی دیکەش بهێنێتە کایەکەوە، بۆ ئەم مەبەستەش گروپێکی بۆ فۆتۆگرافەرە کچەکانی گەرمیان دروستکردوە، ئەمە سەرباری ئەوەی چەندین ڕاهێنانیشی لەبارەی وێنەگرتنەوە پێشکەش کردوە.**

ئاسیا حسێن، کچێکی ٢٠ ساڵەی دانیشتوی کەلارە. ئەو ئەگەرچی خوێندکاری زانکۆیە، بەڵام لەچەندین بوار دا چالاکە، کە دیارترینیان بواری فۆتۆگرافییە.

لە دیدارێکی (نەوژین) دا، لەبارەی تێکەڵبونی بە بواری فۆتۆگرافیەوە، وتی: «سەرەتای ئاشنایەتیم بە بوارەکە لە خولە فۆتۆگرافیەکانەوە دەستی پێکرد، لە سێ خولدا بەشدار بوم و پاشان کامێرام کڕی».

وتیشی: «پێمخۆشە لەژیانمدا بواری فۆتۆگرافی پەرە پێبدەم و بیکەم بە پیشەی ژیانم، لە ئێستاشدا توانیومە لە سێ پێشانگای فۆتۆگرافی بەشدار بم».

حەزی ئەو بۆ فۆتۆ، وایکردوە کە دەستگرۆیی کچانی تریش بکات بۆ ئەوەی بێنە بوارەکەوە، هەروەک گروپێکیشی دامەزراندوە، بەناوی (گروپی فۆتۆگرافی کچانە لە گەرمیان)، ئەمە جگە لەوەی لەشارەکانی: (کەلار و کفری)ش چەندین خول و ڕاهێنانی بۆ فێرخوازان لە بواری فۆتۆ دا کردوەتەوە.

ئاسیا، لەبارەی کامێرا و کۆمەڵگای گەرمیانەوە دەڵێت: «لەئێستادا ژمارەیەکی باشی فۆتۆگرافەر هەن کە لە پارک و بازاڕ و دوکانەکاندا وێنە دەگرن، بەڵام هەمیشە ئاسان نییە بۆ کچێکی گەرمیانی داوا لە کوڕێک بکات وێنەی بگرێت، بۆیە بونی فۆتۆگرافەری کچ نەک باش، بەڵکو پێویستە و نەبونیشی بۆشایی دروست کردوە».

بونی فۆتۆگرافەری کچ نەک باش، بەڵکو پێویستە

بە باوەڕ بەخۆبونێکی زۆرەوە دەڵێت: «من هەوڵ دەدەم ئەو بۆشاییە پڕ بکەمەوە و بەشێوەی ڕەسمی دەست بە کارەکە بکەم، بەتایبەت ئەوکاتانەی خوێندنی زانکۆ تەواو دەکەم».

ئاسیا حسێن، خوێندکاری قۆناغی چوارەمی کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی گەرمیان بەشی زمانی ئینگلیزییە، ئەگەرچی هێشتا کۆلێژی تەواو نەکردوە، بەڵام هەر زو دەستی داوەتە پەرەدان بە زمان و ئێستاش وەکو وەرگێڕ کاردەکات و بابەتی جۆراوجۆر بۆ زمانی کوردیی لە ئینگلیزییەوە وەردەگێڕێت، ئەمە جگە لەوەی زمانەکانی عەرەبی و فارسیش بە باشیی دەزانێت.

هەر لە بواری زمانیشدا، ماوەی ٦ مانگە خولێکی فێربونی زمانی ئینگلیزیی بە خۆبەخشی کردوەتەوە و ٤٠ فێرخواز تیایدا بەشدارن.

ئەو کچە لەبارەی نهێنیی سەرکەوتنەکانی و چالاکبونی لە کۆمەڵگادا، ئاماژەی بە دو وشە کرد «هێز و ئیرادە».

سەرکەوتن تەنها هێز و ئیرادەی خۆمانی بەسە

ڕونیکردەوە: «من پێموایە سەرکەوتن تەنها هێز و ئیرادەی خۆمانی بەسە، ئەگەر حەزمان لە بوارێک بێت ئەوا دەبێت هەرگیز تانە و تەشەر کارمان لێ نەکات و گوێی پێ نەدەین».

واشیدەبینێت ئەگەر کچ بیەوێت لەبوارێکدا سەربکەوێت، ئەوا لە گەرمیان ژمارەی خولە بێبەرامبەرەکان لە هەمو بوارێکدا زیادی کردوە و کۆمەڵگا تا ڕادەیەکی باش هاوکار دەبێت، بەڵام دەشمێنێتەوە سەر ئەوەی کچانیش خۆیان هەوڵ بدەن.

پێشیوایە کە هەندێک لە کچان کۆمەڵگا و خێزان دەکەنە بیانو و لەماڵەوە دادەنیشن و هیچ ناکەن، لە بری ئەوەی پەرە بەو توانا و بەهرانە بدەن کە هەیانە.